ئەمیندارێتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان یارمەتی لە چاپدانی داوە

جەلال خەلەف ژالەیی

چاپخانەی الحوادث

بغداد - ١٩٨٧

# به ناوی خوای گەورە

**خوێنەری بەرێز :**

نووسین لـە خۆیدا کارێـکی سووکو ئاسان نیە ، بەتایبەتی نووسین لەبارەی بابەتێکەوە ، وەکو بابەتی ( کەسێتی ) نەخوازەلا بە زمـانی کوردی ، چونـکە ناکۆیەکی زۆر هـەیە لە نێوان دەروونزانەکـاندا ، بەتایبەتی لە نێوان : فرویدی‌یەکانو ئەدلەری‌یەکانو یۆنگی‌یەکـاندا ، لەبارەی چـۆنێتی دروستبوونو دۆزینەوەی جۆرەکـانی کەسێتیدا تا ئێستەش پشتگیرەکانی ئەو زانایانە بەردەوام مشتو مڕیانەو ڕێناکەوون .

ئەمجا کە مرۆڤ کـەوتە هەڵوێستێکی ئاوهـای ترسناکەوەو لەرزی لێ نیشتو نەی وێرا بەرەو پێشەوە بڕواتو هەنـگاو هەڵهێنێت ، بێ‌گومان دەبێت پاڵنەرێك هەبێت وباڵی پێـــوەنێتو زاتی بشـکێنێت ، بو ئەوەی ترسەکەی بەسەر بچێتو لەو کارەی کە لێی تۆقیوە بچێتـە پێشـــەوەو پێی ڕێ داگرێت .

ئایە بڵێیت ئـەو هۆیانە چین کـە زاتی منیان شـکاند ، بۆ ئەوەی ئەم سەرەو زووڕەیە بیرم ، باڵیان پێوە نام ؟

بە ڕاستی تەنها هۆیەك نەبوو ، کە ئەم کارەم بێ ئەنجـام بدات ، بەڵـکو چـەند هۆیەك بوو هەراسانیان کردمو ئەم بابەتەیان پێ نوسیم ، گرنگترینیان ئەمانەن :

**یەکەم :**

لە ژیانی ڕۆژانەمـدا ، کاتێك گوێم هـەڵدەخست بەربای گوێم دەکـەوت کـە زۆر کەس باسی کەستێی ئەمو ئەو دەکەن لێیان دەکۆڵنەوە بۆم دەرکەوت بابەتی ( کەسێتی ) لـەم چەرخەدا بابەتی سـەر زوبانە ، وەکو کۆمپیوتەرو کـەشتی ئاسمانەوانیو جەنـگی ئەستێرەگـەریو نەشتەرگەری دڵو تیشکی لیزەر نەخوشی ئەیدز ، ناوی لە نێو نێوانە کەمکۆڕو کەم کۆمەڵ وێڕ هـەن کاتێك کە دەگیرێن ، باسی ووشـەی ( کـەسێتی )یان تێـدا نەکرێت ، ئیتر بە زمانێـکی ڕاست بێت یان بـە زمانێـکی هـەڵە بێت ، لـەم چەرخەدا کە ئێمە تێدا دەژین کـە لـە هـەموو ڕوویەکەوە ، ڕۆشنبیری جۆربەجۆرو بابەتی هەموو زانیاری وزانستی یەك بە تازەترین ڕێگەی چاپەمەنی بێت ، یان بە ڕێـگەی رادویۆو تەلەفزیون یان بە هەر ڕێگەیەك هەبێت پێمان دەگات ؛ کەم کەس هەن کە حەز نەکەنو هەول نەدەن کەسێتیان بـگۆڕن ، خـەباتو کۆششی ژیانیان بە شێوەیەکی گونجاوترو لەبارتر داڕێژن .

بێجگە لەمانەش کەسێتی خۆی لـە خۆیدا بابەتێکی زۆر گرنـگە ، چونـگە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە مرۆڤەکەوە هەیە ، چ لەبارەی کۆمەڵایەتییەوە ، چ لەبارەی پیشەکەیداو چ لەبارەی توخمییەوە ، هەر کەسێتی مرۆڤە لە پیشەکەیدا سەری دەخـات ، یان دوای دەخات ، هەر کەسێتییە مرۆڤ لـە چـاوی کەسانی دیکەدا گـەورە دەکاتەوە یان بچوکدەکاتەوە ، هـەر کەسێتییە ژیانێـکی هاوسـەری بەختیارو گوزەرانێکی ئاساییو پەوان بۆ مرۆڤ مسۆگەر دەکات بە هۆی کەسێتییە بە هێزەکەیەوە بوو (چەرچڵ - ١٨٧٤ - ١٩٦٥ ) لە گەشتە نهێنییەکەیدا بۆ مۆسکۆ توانی ( ستالین ١٨٧٩ - ١٩٥٣ ) قایل بـکاتو هاوکـاری یەکبکەن لەگەل میرییە هاوپەیمانەکانی دیکەدا ، دژی ئەڵمان ڕاوەستن،

کە لە کۆمەی لێکەن بە سەریدا زاڵ بن بە هۆی کەسێتی یە بەهێزەکەیەوە بوو قەشە ڕاسوتین توانی لە ڕێگەی قەیسەرو ژنەکەیەوە دەست بە سەر وولاتی ڕوسیادا بگرێتو بە هەوەسی خۆی جڵەوی ڕاکێشێت،واتای وایە کەسێتی ئاوێنەیەکە ، دەروونو توانستو لێوەشانەوەو لێهاتنو تەواناى مرۆڤ دەنوێنێت •

بەم گوێرەیە بێت مرۆڤ کەسێتی یەو کەسێتیش ئامانجو هیوایە ، ئامانجو هیواش ژیانەو مردن نی یە •

**دووەم :**

بە کوردی نەبوایە ئەم بابەتەم نەدەنووسی :

چونکە زمانی کوردی زۆر پێویستی بە نووسینی ئەم جۆرە پەرتووکانە یان بابەتانە هەیە لاوانی کوردیش زۆر پێویستیان بە خوێندنەوەو تێگەیشتنی ئەم جۆرە بابەتانە هەیە کەسێتی کوردی ئەم چەرخە زۆر پێویستی بە پشوو ئازایەتی و سەقامگرتن لە خۆبوردن بە خۆدا ڕابەرمون هەیە •

بە داخەوە دەڵێم : زۆر شوورەیی یە بۆ ئەو کورد زوبانانەی کە بە کوردی ناخوێننەوە کە کاتێك لە یەکێکیان دەپرسیت ، ئەوە بۆ ئەو دێرە کوردی یە ناخوێنیتەوە ؟

خۆی ناسك دەکاتەوەو دەڵێت : ئەمن (دراسە)م بە کوردی نەبووە ئەی باشە ئێمە (دراسە)مان بە کوردی بووە ؟!

خوێنەری بەڕێز :

ئەم پەڕتووکە بێجگە لەوەی کە جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی دەروونی و کومەلایەتی یە شێوەو شێوازێکی ئاسانی گرتووە لە پێشکەش کردنی

بابەتەکـــاندا ، ئەمیش بۆ ئەوەی زۆربەی زۆری خوێنـــەوارە ڕادە ماناوەندی‌یەکانیش کەڵـکی لێ وەرگرن‌و بە ڕەوانی‌و ئاسانی‌تێی بگەن، لە پاڵ ئەوەشدا زۆر جار لای داوەتە لاوەو بە شێوەیەکی ڕاستەو خـــۆ هانی گەنج‌و لاوەکانی داوە ، بۆ خۆ جوان کردن ، بە ڕسکاندنی باشترین نیشانەو سیفاتەکانی کەسێتی‌و کۆمەلایەتی باش‌و بەسوود لـــە خۆیاندا هەرچەند جارجاریش توانجی هاویشتووەو وەکو ڕەخنـــە گرتنێـــکی کۆمەلایەتی مەبەستی ئەو کەسانەیە کـە بونەتە دڕک‌و چقڵ ، لە ڕێـگەی پێشکەوتنی نەتەوەی کوردماندا ، ئەمەش لە ڕێـگەی دەست‌نیشان کردن‌و باس کردنی سیفاتە ناشیرینە نامۆکانی کەسێتی مرۆڤی کورددا ، ئەمیش هەر لە بەر ئەوەیە کە هانی گەنجەکان بدەین بۆ خۆ جوان کردن‌و خۆ ڕازاندنەوە ، بە جوانترین سیفاتی کۆمـەلایەتی بەســوود و تۆڕدان‌و پێزاندن فڕێزاندن‌و تفانەوەی سیفاتە ناهەموارەکانی کەسێتی •

لەبەر ئەم هەموو گرنگی‌یەی کە کەسێتی هەیەتی • بێجگەلە ئامانجی نەتەوەیی مەبەستیشم ڕابەری کردن‌و ئاڕاستە کردنی منداڵانی کوردە تـکام وایە ئەمیش کەلێنێکی زۆر بچووك پڕ بـکاتەوە لـە کتێبخـانەی کوردیدا •

لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نیە ئەم (هەوڵە)م لە هەموو کەم‌و کوڕیەك بە دوور بێت چونکە تەواوی هەر بۆ یەزدانە ( الكمال لله فقط ) بەلام خوا ئاگادارە کە هیچ کەمتەر خەمی‌یەکم نەکردووەو بێجگە لە خزمەتگوزاری نەتەوەکەمان‌و بەرز کردنەوەی مرۆڤ ، هیچ مەبەستێکی ترم نەبووە •

**جەلال خەلەف زالەیی**
**١٥-٩-١٩٨٥**

# کەسێتی

ووشەی کەسێتی لـە زمـانی کوردیدا ، لە ووشـەی کەسەوە(۱) وەرگیراوە ، کـە بە مانا ( خزمە ) یان ( خاوەنە ) ، یان ( بەختێوکەر ) هـەرچی چۆنێك هەبێت ، ئەم ووشەیە لە کوردیدا بەرامبەر ووشـــەی ( الشخصیة )(۲) بەکـار هێنراوەو ووشـەی ( کەس ) بە پـیاو ماقوڵو ڕەووشت ڕێكو فریاد ڕەسو بەناوبانگ ، بەکـــار هێنراوە ، هەر وەکو چۆن ووشـەی ناکەس بە واتای ( عدیم الشخصیة )و هـەتیو مجـــەو چاوچنۆكو بۆدەڵە ، بەکـار هێنراوە ، وەکو شـــاعیری بەناوبانـگ (مەحوی) دەڵێت(۳)

چیبکەم نە ئەو کەسەم ، کەسم بێ لە لا بە کەس
خۆشم نەگەیمە ئەو کەسە ئەو من بکا بە کەس

وە دەڵێت :

موحتاجی مەرحەمەتی‌یە ، چ ناکەس ، چ کەس ، بە گەل
ئەو تاقە ێیکەسێکە کە گرتی خۆدا بە کەس

هەرچەند واتای هەردوو ووشەکە لە فەرهەنگی گەلی کوردیدا لە

---

(۱) فەرهەنگی ئەستێرە گەشە ، لە باسی ووشەی (کەس) دا ٠
(۲) گۆڤاری پەروەردەو زانست ژمارە ( ۷ ، ۸ ) سالی چوارەم ١٩٨٤٠
(۳) دیوانی ( مەحوی ) بیتی (س) چاپی دووەم ١٩٨٤ ٠

فەرهەنـگی زمانی عەرەبیدا ، یەك واتە ناگرێتەوە ، بەڵام هەندێك لـە نوسەرەکان بە واتا خزمایەتی‌و کەڵك بەخش‌و بەرهەم دەرو بە هاوارەوە چوون‌و بـە پیرەوە چوونی‌ی کەوتووان‌و لێقەوماوانەوە ، بەکـاریان هێناوە ، وەکو لە کوردیدا دەووترێت : بە خوا برا ( چەتۆ کەسـە نە گاڵتە ) واتا : هەرگیز دوا ناکـەوێت لە بەهاوارەوە چوونی خزمـە لێقەوماوەکانیو ، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا ( الشخصية ) بە واتا دەربەڕینی لەش‌و دەرکەوتن‌و دیاربوونێتی •

هـەردوو ووشەکـە لەباتی ووشەی(٤) Personality بە کاردەهێنرێت ، کـە ئەمیش لە ووشەیەکی لاتینی‌یەوە وەرگیراوە کە پێی دەووترێت ( برسونا ـ Persina ) کە واتاکەی لە کوردیدا ( ڕووپۆش‌کردنە ـ القناع ) ، ئەمیش لە هەردوو ووشە ( بیر ـ سوناری Per-sanare ) یەوە وەرگیراوە ، واتە لـە ڕێـگەی دەنـگەوە ، ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ سـەردەمی ئەگریکی کۆن ، کاتێك کە ئەکتەرەکان لـە سـەر شانۆ دەیان نواند ، بۆ ئەوەی سام‌و نیشانە زەقەکانی ئـەو پاڵەوانانە بەرچاو خـەن ، کـە ئەمان دەیان نواندن‌و لە سـەر شانۆ لاسایی‌یان دەکردنەوە ، ڕووی خۆیان دەپۆشی هەندێ لە زانایان دەڵێن: کاتێك ، ئەو ئەکتەرانە (ڕووپۆش)یان دەکرد ، ئەگەر دەم‌و چـاویان کونج کونج‌و شێواو بوایە •

ئەمیش بۆ ئەوەی کـە ناشیرین‌و ناڕێـکی دەم‌و چاویان لە بینەران بشاردایەتەوە بە کورتی دەڵێن ئەم ووشەیە وای لێهاتووە ، ئێستـاکی

---

(٤) موسوعة علم النفس ـ اعداد أسعد رزوقي ـ مراجعة د. عبدالله عبدالدائم ط (١) ١٩٧٧ الناشر المؤسسة العربية للدراسة والنشر ـ بيروت ـ لبنان •

هەر وەکو دەروونزانی بەناوبانگ (کارڵیونگ)(٥) دەڵێت : بە واتایەکی نوێ بەکـارد دەهێنرێت ، بە واتانەو ڕووپۆشە بەکاردەهێنرێت کە پێویستە هەموو کەس بیپۆشێت ، بۆ ئەوەی بتوانێت لە سەر شانۆی کۆمەڵ دەوری خۆی بە باشی ببینێت •

بە هۆی ئەم ڕووپۆش کردنەوە ، دەتوانێت ، کـەو کوڕیە بەسەرهاتە تایبەتی‌یەکانی خۆی لە پێش چاوی کەسانی دیکە ، بشارێتەوەو خۆی ڕێك‌و پێك بخات •

---

(٥) کارڵ یونگ ( ١٨٧٥ ــ ١٩٦١ ) زانایەکی سویسری‌یەو کوڕی کابرایەکی قەشەیە ، دوای ئەوەی وانەکانی نوشداری خوێندوە بۆ تە یارمەتی دەری برۆیەرو جانێ ، دوایی یە جۆرێکی وا خۆی بە فرویدا هەلواسیوە ، بەتەمابووە لە سەر تەختی پادشایەتی دەروون شیتەڵی دای بنێت دوای مردنی خۆی ، هەروەکی چۆن (یوشەع) دوای مردنی (موسا) پێغەمبەر لە جێگەکەی دانیشت ، بەڵام ئـەو پەیوەندی‌یە خۆشەی کە هەیان‌بوو بە هۆی دەربڕینی ڕاتازەکانی فرویدەوە تێك‌چوو ، تاوای لێ هات (یونگ) پەیڕەوێکی تایبەتی بۆ خۆی دانا ، کە لە پەیڕەوەکەی فرۆیدو ئەدلەرەوە دوور بوو • گرنگترین نوسینەکانی ئەمانەن

١ ــ چەند بەشداری‌یەك لە دەروون زانی شیتەڵیدا ١٩٢٨ بلاوی کردەوە

٢ ــ چەند شێوەیەکی دەروونزانی ١٩٣٣ بلاوی کردەوە

٣ ــ کەسێتی تەواو ١٩٣٩ بلاوی کردەوە •

٤ ــ خۆیەتی دەرنەخراو ١٩٥٩ بلاوی کردەوە •

## پێناسەی کەسێتی

هەندێك لە زاناکان ووتوویانە : کەسێتی بریتی‌یە لە توانای مرۆڤ لە سەر کردەوەی کۆمەڵایەتی •

لە ڕاستیدا زۆر لە زانایان هەوڵیان داوە کە سنوورێکی تەواو بۆ نیشانەکانی واتای زاراوی ( کەسێتی ) دابنێن ، دوای چەند هەوڵو تەقەلایەکی زۆر چەند پێناسەیەکیان[٦] داناوە بۆ کەسێتی ، ئەو پێناسانەش کراوون بە چەند بەشێکەوە :

بەشێکیان گرنگی داوە بە نیشانەکانی دیوی دەرەوەی لەشی مرۆڤ ، چاویان لە نیشانە شاراوە نادیارەکانی دیوی ناوەوەی لەشی قوچاندووە ، ئەو پێناسانەش وەکوو ئەم پێناسانە :ـ

١ ـ دەروون زانێکی ئەمریکی دەڵێت : کەسێتی بریتی یە لە کۆی ئەو گوورجو گوڵانەی کە تێبینی‌یان دەکەن ، لە ڕەووشتە ئاشکەراکانی مرۆڤدا بۆ ماوەیەکی دووروو درێژ •

٢ ـ زانایەك کە ناوی شارمانە دەڵێت کەسێتی بریتی‌یە لە ڕەووشتە هەڵبژێراوەکانی مرۆڤێك •

---

(٦) الشخصية ـ تالیف د• نوری الحافظ ص١٦

٣ ـ زانایەکی دیکە دەڵێت : کەسێتی بریتی‌یە لە تین تێکردن‌و کارتێکردن لە کەسانی دیکە •

بەشی دووەمیان گرنگی داوە بە نیشانەکانی دیوی ناوەوەی لەشی مرۆڤ ، مەبەستمان نیشانە نادیارەکانن لەبەر ئەوە ووتوویەتی : کەسێتی شێوەی سروشتی دیوی ناوەوەی لەشی مرۆڤە ، واتە : ئەو مرۆڤە کەسێتی دارە کە گیانی پاکەو تێکی سوکەو شێوەیەکی سروشتی هەیە •

بەشی سێیەمیان گرنگی داوە بە نرخی ئەو کەسە لە کۆمەڵدا ، لەبەر ئەوە پێناسەی کەسێتی دەکات‌و دەڵێت : مرۆڤی کەسێتی دار ئەو کەسەیە کە نرخی کۆمەڵ دەزانێت ، مافەکانی ئەندامەکانی دەپارێزێت ، پێویستی‌یەکانی سەرشانی دەپارێزێت‌و جێبەجێیان دەکات ، بەشێوەیەکی ڕاستی خۆی لە کۆمەڵدا دەگونجێنێت •

بەشی چوارەم : گرنگی دەدات بە هەموو نیشانەکانی کەسێتی نیشانە ئاشکەراکان‌و نیشانە شاراوەکانیش •

## باشترین پێناسە

لە کاتێکدا کە چاو دەخشێنین بەم پێناسانەدا ، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هیچیان مەرجی باشترین پێناسەی کەسێتی‌یان تێدا نی‌یە چونکە باشترین پێناسەی کەسێتی پێویستە ، ئەم ناوەخنانەی تێدا هەبێت :ـ

١ ـ یەکگرتن : واتە : کەسێتی مرۆڤ هەر بریتی نی‌یە ، لە هەبوونی نیشانە باشەکانی کەسێتی لە مرۆڤێکدا ، بەڵکو پێویستە ئەو

نیشانانە ، هەر وەکو هەن دەبێت یەکگرتن و ڕێکەوتن و گونجاندنیان لە نێواندا هەبێت •

٢ ــ دینامیکی : واتە : پێویستە ئەو نیشانانەی کە لە مرۆڤدا هەن ، لە کاتی گەشەکردنیاندا ، تێکەڵاو بن و شەڵەقاوبن و تێکهەڵچوونو پەونەقداربن •

٣ ــ بەردەوامی پێویستە ئەو نیشانانە تا ڕادەیەکی زۆر بەردەوامی‌یان تێدا هەبێت ، تا ڕادەیەك ڕۆشنایی و برتەوی‌یان تێدا هەبێت ، وەکو : شێوەی لەش و زیرەکی گشتی ، لێهاتن و هەڵکەوتن و لێوەشاندنەوە •

٤ ــ هیوا : لەبەرئەوەی بارەکانی لەشی مرۆڤ بە تەنها بۆ کەسێتی بەس نی‌یە ، هیواو مەبەست و ئامانج و ژیری ئەو مرۆڤەش بۆ باشترین کەسێتی بوونیان مەرجە •

٥ ــ گونجاندن لەگەڵ ژینگەدا : نابێت لێرە دا پێنەین لە ڕادەی تینی هێزە ماددی‌یەکان و کۆمەڵایەتی‌یەکانی ژینگە هەر وەکو چۆن نابێت باز دەین بە سەر دروست بوون و دارشتنی کەسێتی لە جوارچێوەیەکی تایبەتیدا ، چونکە هەر وەکو مرۆڤ کار دەکاتە ژینگە ، ئاوەهاش ژینگە کاردەکاتە سەر مرۆڤ،لەبەر ئەوەیە کە کەسێتی هەر ژینگەیەك قاڵبێکی تایبەتی و چێوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە ، هەر لەبەر ئەوەیە ، ڕۆژێکیان لە گوندێك بووم ، کابرایەکی ئەفەندی بە فەرمانی کۆ کردنەوەی باج هاتبووە ئەو گوندە،دووای یەکتر ناسین چووین بۆ بن سێبەری ئەوداروو درەختانەی کە نیزیك بوون لە گوندەکەوە،ڕێکەوت وابوو ، بەلای‌کانی ژناندا تێپەڕین ، هەر ئەوەندەم زانی هەرچی کیژۆڵەی سەر کانێکە

هەبوون دەستیان کردە پێکەنین بە ئەفەندی و ووتیان ئای ئای ئەو پیاوە سەری ڕووتەو بە سەری ڕووتی دەسوڕێتەوە •

کاکەی ئەفەندیش ووتی خۆ من وام زانی هیچم نەهێشتۆتەوە ڕۆنم داوە لە سەرو قژەکەمو جوان جوان شانەم کردووە !

٦ ـ جیاوازی کەسێتی هەر کەسەو ، تاکێکی تایبەتی هەیە تینێکی تایبەتی خۆی هەیە ، بە جۆرێك نابینین دوو کەس لە یەك بچن ، ئەم جیاوازی‌یە کە بنچینەیەکی ڕاستی‌یە لە دروست‌بوونی واتای کەسێتیدا •

ئەمجا ، ئەو پێناسەیەی کە ئەو شەش مەرجەی تێدا هەبێت ئەم پێناسەیەیە کە باسی دەکەین :

کەسێتی بریتی‌یە : لەو نیشانە لەشی‌و ژیری‌و کۆمەڵایەتی‌و سۆزی‌یە ، هەڵبژاردە ، پوختە ، باشە ، زۆر خاوەنە دینامیکی‌یانەی ، بۆ مرۆڤ دروست دەبێت‌و یارمەتی دەدات لە سەر باشترین‌و ڕێك‌و پێکترین و هەڵبژاردەترین گونجاندن ، لەگەڵ ئەو ژینگەیەی کە تێدا دەژی ، ئیتر ئەو ژینگەیەش ماددی بێت ، یان کۆمەڵایەتی بێت •

هۆکانی دروست بوونی ئەم نیشانانەش ، ژینگەی مرۆڤ ، و ئەو تواناو لێهاتنەیە کە لە بۆ ماوەوە بۆمان ماوەتەوە ، یان لە هەردوکیانەوە بۆمان دروست دەبێت :

لەم پێناسەیەدا دوو خاڵی زۆر گرنگمان بۆ دەردەکەوێت

١ ـ کەسێتی یەکەیەکە کە بتەوێت لێی بکۆڵیتەوە ، دەبێت •

وەکو ڕێکخراوێکی یەکپارچەی گشتی ( گشتالت ) تەماشای

بکەیت ، چونکە پارچەکانی لەیەکتابنەوە •

۲ ـ ئەگەر هـاتو شیتەلی پارچەکانت کرد ، پێویستە مەبەست داڕەنین و ڕیز کردنی بێت ، بۆ لێکۆڵینەوەی ، بەس •

۳ ـ پێویستە ئەوەت لەپێش چاو بێت ، کە گەردیلەکانی کـەسێتی بەشێوەیەکی بەردەوام بە ناویەکدا تێك سڕاوون و تێکهەلچوون

## نیشانەکانی کەسێتی

لــە ڕاستیدا ئەو زانایەنەی کــە بە شوێن واتایەکی پڕ بە بالآی کەسێتیدا گــەڕاوون تووشی گێرمەو کێشەیەکی زۆر بوون ، لەگـــەڵ ئەوەشدا ، ئەنجاش بە ئامانجی خۆیان نەگەیشتوون ، بە هەناسە ساردی گــەڕاونەتەوە •

چونکە بۆیان دەرکەوتووە کە هەر وەکو چۆن کەسێتی لە کەسێکەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی دیکەو جیاوازی لە نێوانیاندا هــەیە ، ئاوەهـــاش خەڵکی جیاوازن ، یان هەر کۆمەڵەو کەسانی هەر ناوچەیەك ، جیاوازن لــە هەڵبژاردنی نیشانەکانی کەسێتیدا ، ئەمجا لەبەر ئەوە هەندێك کەس :ـ مرۆڤی ساماندارو وپۆشتەو پەرداخیان بە لاوە بە کەسێتی‌یە ، هەر وەکو پیرەمێرد دەڵێت :

هیج کەس ماڵی خۆی بە کەسێ نەداوە
کەچی ئاموشۆی دەولەمەند باوە

هەر وەکو چۆن هێندە خەسویەك ، زاوای دەوڵەمەندی بە لاوە بە کەسێتی‌یە بەڵام کابرایەکی دیکە دەڵێت

مرۆڤی کەسێتی‌دار ئەو کەسەیە کە ڕووخۆش‌و دڵخۆش‌و دەم بەپێکەنین‌و خەندەیە •

هەروەها ئەگەر بێتوو لەو کەسانە بپرسین کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا تووشیان دەبین ، واتای مرۆڤی بە کەسێتی کامەیە ؟ هەیانە •

دەڵێن مرۆڤی بـــە کەسێتی ئەو کەسەیە کـە ئازاو بەجەرگوو جوامێرە ، هەیشیانە •

دەڵێن وانی‌یە بەڵکو مرۆڤی بە کەسێتی ، ئەو کەسەیە کـــە مڕوومۆچەو بێدەنگ‌و کەم قسەیە ، هەر وەها ئەگەر بێتوو بپرسین هەر یەکەو جۆرە وەلامێکمان دەدەنەوە ئەمە چەند نموونەیەکی دیکەیە لـەو وەڵامـــانە :

مرۆڤی بە کەسێتی ئەو کەسەیە کە ڕاستگۆو ڕاستکردەوەیەو هەست بە لێ پرسینەوە دەکات‌و دڵسوزە بۆ فەرمانەکانی خۆی •

مرۆڤی بە کەسێتی ئەو کەسەیە کە باوەڕی بەخۆی هەیەو مرۆڤێکی لێ‌هاتووی بەهرەدارە •

— مرۆڤی بە کەسێتی ئەوەیە ڕووی خۆشەو ئێسکی سووکەو،خوێنی گەرمەو بالآی بەرزە •
— مرۆڤی بە کەسێتی ئەو کەسەیە کە ڕەنگەکانی ئەو جلانەی کە لە بەری دەکات لەگەڵ یەکدا گونجاون‌و ڕێکن
— مرۆڤی بە کەسێتی ئەو کەسەیە جرت‌و فرتی‌زۆرەو لـــە کاتی ئەنجامدانی کارەکانیدا پەلەی زۆر دەکات‌و هەڵەی زۆرە •
— مرۆڤی بە کەسێتی ئەو کەسەیە کە لەبلەبان‌و دەم هەراش‌و زۆر بڵێی‌و زوبان لووس‌و چەنەبازە •
— مرۆڤی بە کەسێتی ئەو کەسەیە کـــە گاڵتەچی‌یەو ، نوکتەبازەو ، هەڵەخەنەو بەم‌و بەو ڕادەبوێرێت •

- مرۆڤی بە کەسێتی ئەو کەسەیە کوانوەو ڕەسەنەو لە بنەماڵەیەکی گەورەو بەناوبانگە ، یان بە ئاین پەروەری ، یان بە ئازایی ، یان زانایی ، ناوی دەرکردووە.
- مرۆڤی بە کەسێتی ئەو کەسەیە کە زۆر زیرەکو بلیمەتو وریایە .
- بە داخەوە دەڵێم زۆر کەس هەن ئەو کەسانە بە کەسێتیدار دادەنێن کە خۆپەرستو زیان بەخشو خراپن ، ئەو کەسانەی کە لە ڕێگەی گەیشتن بە ئامانجەکانیان ، نرخو بەهای خۆیان لە ناو کۆمەڵدا کەم دەکەنەوە پلەی کۆمەڵایەتی خۆیان نزم دەکەنەوە هیچ نەریتو ڕەووشتی کۆمەڵایەتی پەسند ، بە چاوێکی گرنگ تەماشا ناکەن ، بە سەر شانی ئەمو ئەودا تێدەپەڕن وا دەزانن بەرز دەبنەوە .
- هەروەها هەندێك کەس هەن چەندێك ڕۆشنبیریو خوێندەواریان زیاد دەکات ئەوەندە زیاتر ئاسۆی زیرییان تەنگو تەسك دەبێتەوە دەیان بینن دوای ئەو خوێندەواریو ڕۆشنبیرییەی کە دەیچەژن، ئەمجا دەکەونە تیرەگەریتیو تایەفەگەریتیو هۆزبازی ، بە جۆرێکی وا کە باووباپیرە نەخوێندەوارەکانیان نەیانکردووە

بەڵی ئەمان ئەگەر مەبەستیان خزمەت بێت وبڵێن ناتوانین گەلەکەمان بە شێوەیەکی گشتی خزمەت بکەین ، ئەوە قەیناکە ، بەلام ئەو مەبەستەیان نییە،بەلکو ئەو هۆزە گەرییە لە دەروونێکەوە هەڵدەقوڵێت ، کە وا هەست دەکات باووباپیریان بۆیان نەلواوەو پێیان نەکراوەو یان ( ئەقڵ ) یان پێنەشکاوە ئەم تایەفەگەرییە بکەن ، ئەمەش لەباتی ئەوەی کە ئەو مرۆڤە خوێندەوارانە لە

ئاسۆیەکی زیری فراواندا بژین ، بە چاوێکی فراوانو نەتەوەیی خزمەتی گەلی کوردمان بکەن ، نـەك هەمیشـە ووزەی بەهـێزی خۆیان لە نەخشـەکێشـانو ڕێگەدۆزینەوەدا،بەپێی باوەڕێکی تەسكو تەنگەبەر خەرج کەن ، لەباتی ئەوەی کە بیر لە ئامانجو پێشـخستنی گەلی کوردمان بکەنەوە ، بە شێوەیەکی تایبەتی لە کوردستانـــی عێراقــدا •

- دووبارە بە داخەوە دەڵێم هەندێك کەس وا دەزانن کەسێتی باش لای ئـەو کەسانەیە کـە لە خووڕەووشـتیاندا ، ڕاڕانو ، لـە بیروباوەڕیاندا حولحولینو لە هەمـوو هەڵسـانو دانیشـتنێـکیاندا ناڕێکن ، ئەو کەسانە نازانن کە هەموو مرۆڤێك بە ڕەووشتی ڕێكو جوان ، بەبەزەیییو دڵســـۆزیو بە ویـژدان ، سـەردەکەوێت ، و هەموو نەتەوەیەك ئەگەر ئەندامەکانی خوڕەووشتی جوان نەکەن سـەرناکەوونو نەتەوەکەیان سەرناخەنو لەنێو نەتەوەکاندا ڕووی سپی ناکـــەن •

## نزمترینو بەرزترین نیشانەکانی کەسێتی :

لەبەر ئەوەی تەنها نیشانەیەك لە نیشانەکانی کەسێتی ، کەسێتی مرۆڤ ، لە نێو کۆمەڵدا بەناوبانگ ناکاتو دەری ناخات ، بەڵکو چەند نیشانەو سیفەتێکی تێکڕایی ئەو کەسێتی‌یە بەرز دەکەنەوەو دەنگی پێ پەیدا دەکەن ، هەرچەند تەنها نیشانەیەکیان هەڵدەکەوێتو لەوانی دیکە ئاشکراترو دیاری تر دەبێت ، ئەمجا لەبەر ئەوە لێرەدا دێن بەرزترینو نزم‌ترین پلەی ئەو نیشانانە ، لە گەشەو دروست‌بوونی کەسێتیدا دیاری دەکەینو ڕونیان دەکەینەوە :

### ١ ــ لەش‌ولار :

ئێمە کاتێك لە دوورەوە ، چاومان بە کەسێکی لەش‌گەورەی ، بالآبەرزی ، بە سەروسیما ، دەکەوێت ، یەکسەر سرنجمان بۆلای خۆی ڕادەکێشێت ، بەڵام ئەم سەرنج ڕاکێشانە ، هەندێك جار ئەوەندە بڕ دەکات تا دەگەینە خزمەتیو قسەی لەگەڵ دەکەین ، ئەو کاتەیان بە زمانی شیرینیو ووتەی خۆشی سامو ڕێزەکەی خۆیمان بەسەردا دەسەپێنێت ، یان ئەم کەسە یەزدان ، زوبانێکی شیرینو دەمێکی لەبارو ، و تووێژێکی ڕەوانی پێ نەداوە ئەو کاتە وەکو مەنجەڵێك ئاوی ساردمان بکرێت بەسەردا لە شوێنی خۆمان سارد دەبینەوەو ڕای یەکەممان دەگۆڕێت ، هەر وەکوو گۆرانی‌یە کوردی‌یەکە دەڵێت :

له گوێ بانێ هەتە خوار          دوور کوژەی نیزیك خەسار

ئەمجا ئێمە دەتوانین بڵێین : لەشی گەورەو باڵای بەرزو سەرووسیمای مرۆڤیش بە نزمترین پلەی کەسێتی دادەنرێت ، ئەگەر نیشانەی هەڵکەوتوویی دیکە لەو مرۆڤەدا ، بەدی نەکرێت •

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە لەم جۆرە هەڵویستانەدا ، بۆ پیاو ووتراوە :

( مێرد بە کێشانە نییە ) ، واتە کەسێتی پیاو بە لەش گەورەییو باڵای بەرز نییە ، وەبۆ ئافرەتیش ووتراوە ( زێڕیش بچووکەو نرخی لە زیو گرانترە ) ، هەروەها لە دەوروبەری جەنگی دووەمی جیهاندا ، کاتێك کە تفەنگی برنەو کەوتە کوردستانەوە ، برەوێکی زۆری پەیدا کرد ، پشتێکی ڕاستی هەبوو ، لە دوورەوە نیشانەی بە باشی دەپێکا ، بەندێکی تر داهات ، بۆ ئافرەتی کورتە باڵاو دەیانووت : ( برنەویش کورتە) • وە ئەگەر بێنە سەر جوانو ڕوخسارو قەشەنگی ، ئەمانیش لە دروستبوونی کەسێتیدا بە سیفەتی بناغەیی دانانرێن • بۆ نموونە : زۆر ئافرەت دەبینین کە زۆر جوانیش نین ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لە پێشترنو بەکەسێتی ترن لەو ئافرەتانەی کە زۆر جواننو بە جوانی بەکایان دەنازن ، ئەمەش لە زۆر سەبارەتدا وەکوو پێشوازی کردنی میوانو ،اریفەت کردن ، یان لە مەیدانگەی ( نواندن ) دا لە سەر تەختەی شانۆ ، بە دەردەکەوێت •

## ٢ ـ جلو بەرگ

هەرچەند شاعیری بەناوبانگ پیرەمێرد دەڵێت :

ئیکرامی فەقیر بە نانو دۆیە          لە هەموو لایە (کەوا بخۆیە )

بەلام دەتوانین بڵێین : جلو بەرگیش نزمترین نیشانەی پلەی کەیتی یە ، بەڵکو وەکو بڕوانامەی مەلبەندی نەهێشتنی نەخوێندەواری وایە ، لە چاو نیشانەکانی دیکەدا ، هەر لەبەر ئەوەشە کاتێك دیمەنی مرۆڤە ناودارە کەسێتی دارەکان ، دێتەوە یادمان یان بە خەیاڵ دەیان هێنینەوە پێش چاومان هەرگیز نابرسین ، ئایە تۆ بڵێی جلی چۆنیان لەبەر کردبێت ؟ شێوەی جلو بەرگەکانیان چۆن بووبێت ؟ بۆ نموونە : کەسێتی یە ناودارەکەی سەلاحەدینی ئەیوبی بە جلو بەرگە پاشایانەکەیەوە وەنەبوو ، بەڵکو بە بەچالاکیو ئازایەتیو بە جەرگیو پڕ زیری و دادپەروەرێکەیەوە بووە ، کاتێك کە پاشای کۆرو ناپلیۆنو هیتلەر باس دەکرێن کەس نابرسێت چیان لەبەرکردووەو شێوەی جلەکانیان چۆن بووەو ڕەنگو بڕینەکانیان چۆن چۆنی بووە ، چونکە ئەوان ئەوپەڕی پلەی کەسێتی یان بڕیوە ، بەلام جلی جوانو ڕێكو پێك بە ڕاستی پێویستە بۆ کەسێتی ئافرەت ، زۆر پێویستە بۆ ( کەنیشکێکی ) بە کەسێتی چونکە جلی جوان بەشێکی سەرەکی یە و نیشانەی ڕێكو پێکی یە لە ئافرەتاندا ، بەتایبەتی جلی کوردی ڕەسەن کە دەبینین چ جۆرە کەسێتی یەکی ڕەسەن دەداتە ئەو ئافرەتانەی لەبەری دەکەن ، لە کاتی گەشتو سەیرانا ، هەر لەبەر ئەوەیە کە ( شکسپیر ) ووتوویەتی :

جلوبەرگ مرۆڤ دروست دەکات ، واتا : تینو کار لە کەسێتی یەکەی دەکات و بە رزی دەکاتەوەو باری دەروونیو هەلچوونیشی دەگۆڕێت ، باشترین بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستی یە ئەوەیە کە ئێمە بیر لە خۆمان دەکەینەوەو شەرم دەمان گرێت ، ئەگەر جلێکی شڕی پینەدراوی چلکن لەبەرکەین ، بەلام شانازی بە خۆمانەوە دەکەین کە جلێکی خاوێنو پاكو تەمیز لەبەر دەکەین •

هەروەها ئەگەر بێتو وورد بینەوە لەو قوتابیانەی کە لە ڕۆژانی سەیراندا لە هێندە سەبارەتێکدا جلی کوردی لەبەر دەکەن ڕانکوچۆغەی مەرەز دەپۆشن و پشتوێنی ڕەشی سادە یان ڕەشی گولگولی لە سەر دەبەستن ، چۆن کەسێتی ئەو لاوانە دەگۆڕێت ؟ هەر دەڵێت : ئەو قوتابییانە نین کە لە ژووری خوێندندا گوێت لێ ڕادەگرن و لە بارەی وانەکانەوە گفتوگۆت لەگەڵ دەکەن . هەروەها ئەو کیژۆڵانەی کە کاتێك جلی مۆدە دەگۆڕن بە جلی کوردی ڕەنگاو ڕەنگ بە دوگمەو دولاب و کەمەرەو زنجیر دەیانڕازێنەوە ، چۆن تین دەکاتە سەر کەسێتییان و دەیان گۆڕێت ؟ بەڵگەیەکی تریش بۆ ئەوەی کە جلوبەرگ باری دەروونی مرۆڤ دەگۆڕێت و کار دەکاتە سەر ڕەوشتی ، ئەو کەسانەیە کە جارجار بۆ بازرگانی یان بۆ گەشت ڕوو دەکەنە شارە گەورەکان ، یان دەچنە دەرەوەی عیراق ، دەبینین جلەکانیان دەگۆڕن و جلی چاکەت و پانتۆل دەپۆشن ، ئەگەر بێتو تووشی یەکێکیان بیت و بیتە هاوڕێیان لە گەڕێنێکدا یان لە فڕۆکەیەکدا ، دەبینیت ئەو جلوبەرگە چەندێك کاری کردۆتە سەر کردەوەو ڕەووشتیان،هەڵسان و دانیشتنیان.

بەڵام هەروەکو لە سەرەتاوە ووتمان جلوبەرگ تەنها خۆی بەس نییە ، بۆ دروست بوونی کەسێتییەکی باش ، بەڵکو هەر لە خۆیدا سیفەتێکی بناغەیی نییە ، چونکە زۆر کەس هەن گوێش بە جل و بەرگیش نادەن و لەگەڵ ئەوەشدا کە دێنە مەیدانی چالاکی و خۆدەرخستنەوە ، کەم کەس دەتوانێت تۆزی قولیان بشکێنێت .

## ٣ ــ زیرەکی

زیرەکی بە لای زۆر(٧) ترین کەسەوە هاوواتەی (ترادف) ووشەی

(٧) اصول علم النفس : دکتور : احمد عزت راجح ص٣٤١ .

(ووریایی)یە کـە بریتی‌یە لەوەی مرۆڤ ووریای ئەو کارانەو کارلساتانە دەبێت لـە دەوروبەری ڕوو دەدەن ، هەروەها بە واتای (زرنگی)ش بەکار دەهێنرێت ، و بە واتای کارامەیی‌و کردەوە کردنی ڕێك‌و خـۆ قوتار کردن ، لە تەنـگوو چەڵەمەش بەکار دەهێنرێت .

بەڵام زیرەکی بە لای دەروون زانەکانەوە بە واتا : زوو تێگەیشتن‌و داهێنان‌و هەلـەنگاندن‌و توانا لە سەر ئاراستە کردنی بیر کردنەوەیە بۆ ئاقارێکی دیاری کراو . بە ڕاستی زیرەکی بە چەندەها پێناسە ناسێنراوە، بەڵام لێرەدا مەبەستی ئیمە ئەوە نی‌یە ، بەڵـکو مەبەستی ئێمە ئەوەیە کـە بلێین : ئیمـە وا دەزانین زیرەکی هـەیوو شتێکە لـە زیانی مرۆڤـداو دەبێتـە هۆی سەرکەوتنی‌و دەیـکاتە خـاوەن کەسێتی‌یەکی ناودار بەڵام زانایان وا نالێن ، بەڵـکو دەلێن : هەرچەند زیرەکی سیفەتێـکی بناغەیی‌یە بۆ دروست‌بوونی کەسێتی مرۆڤ بەڵام بە تەنها نا بێتـە هۆی سەرکـەوتنی ، بەڵـکو پێویستە ئەو کەسە زۆر لـە سیفاتەکانی کەی تێدا هـەبێت .

زۆر لە دەروون زانەکان(٨) دەلێن : زۆربەی مرۆڤە ناودارەکان بە زیرەکی‌و زۆرزانی سەرنەکەوتوون ، بەڵـکو دەربەدەری‌و کەساسی‌و نەبوونی ، بەهرەی بێ پەیدا کردوون‌و بۆ سەرکەوتن باڵی پێوە ناوون ، بەڵـکو هەندێکیان وەکوو ( مارگریت ) ڕای وایە کە مرۆڤی بلیمـەت هەرگیز بە خاوەن کەسێتی‌یەکی بەناوبانگی کۆمەلایەتی نابێت .

وا دیارە ئەم زانایە لەبەر ئەوەیەتی ، کردەوەکانی مرۆڤی بلیمەت ئاسایی نین ، لەبەر ئەوە کەسانی دیـکە بە مرۆڤی لاگریان دادەنێن ،

---

(٨) علم النفس في الحياة العملية . تاليف د ـ برهانرت ـ ترجمـة الدكتور ابراهيم عبدالله محى ص١٣٦

وەکو کردەوەی ئەو بلیمەتانەی کە هەولی چاککردنی باری کۆمەلایەتی ، یان ڕامیاری ، یان ئابوری ، دەدەن ، ئەمجا ئەو بلیمەتانە لە سەرەتای ژیانیانەوە خەلکی بە شێتو وێت ناویان دەبەن ، بەلکو زۆربەیان تا لە ژیاندا بوون پرسکی خۆیان نانیان نەخواردووەو بەردەباران کراوون بەردەباران کردنەکەی ( ڕۆسۆ )و ئاشەوانێتی قاحو دەربەدەری هەندێك لە شاعیرو زانا کوردەکان ، بەلگەیەکی ئاشکران بو ئەم ڕاستی یە ، هەرچەند ئەمە بۆنی تیۆرەکەی ئەدلەری لێوە دێت ، بەلام کە کاتێك ئەو بلیمەتانە توانیویانە سەرکەوون بە سەر تەنگوچەلەمەکانی جێبەجێ کردنی بیروباوەڕەکانیاندا ، ئەوسا کە کەسێتی یان بەناوبانگ بووەو مێژوو بەپیتی زێڕین ناوی تۆمار کردوون هەرچەند هەندێکی دیکە لەو بلیمەتانە دوای مردنیان پەیڕەوی ڕێڕەوەکانیان کراوە •

هەرچی جۆنێك زیرەکی ئەبێتە هۆی دروست بوونی کەسێتی یەکی کۆمەلایەتی ، بەلام زیرەکی لە ڕاستیدا فەڕە بۆ مرۆڤ ، ڕووناکی یە بەهرەیە ( بووم )و توانایە ، بۆ ئەو کۆمەلەی کە تیدا دەژی ، بەلکو بۆ کۆمەلانی دیکەش •

بەلێ ڕاستە زۆر جار ئەو کەسەی کە پێی دەلێن ( کەسێتی یەکی لاوازی هەیە ) زیرەکیشە چەند سیفاتێکی باشی تریشی تێدا هەیە ، ( ئەو کەسێتی یە لاوازە )ی ، لەبەر ئەوەیە ، کە ناتوانێت ئەو کاروبارەی پێی سپێرراوە بە تەواوی هەلیان سوڕێنێت ، چونکە توانای قایل کردنی نی یە ، یان ناتوانێت بیروباوەڕی خۆی بە خەلکی بسەلمێنێت ، بەلێ زیرەکە بەلام ناتوانێت بەرەو ڕووی جەملوەر بوەستێت قسەبکاتو بەوێت ڕاکانی خۆی بۆ ئەوان ڕوون بکاتەوە ، چونکە شەرمنە •

جاری وا هەیە ئەو مرۆڤە زیرەکی تێنکی قورسە ، چونکە سەرو ڕوخسارێکی ناڕێکی هەیە ، یان مرۆڤێکی ڕووشکێن‌و قسەڕەقە ، یان خۆش‌گلەیی‌و بە سکالآیە یان توڕەو دەمارگرەو خۆنەگۆڕە ، چونکە زیرەکی‌و کارامەیی ( کەسێتی ) بەرز ناکەنەوە ، ئەگەر جلەوێك نەبێت ڕایان کێشێت‌و ئاراستەیان بکات‌و لەشوێنی خۆیدا بیان گرێتەوە جلەویش بریتی‌یە لە چەپکێك یان کۆمەڵێك لە سۆزو پشوو خۆگرتن‌و سووربوون لە سەر بیروباوەڕ .

ئەگەر لە ٥٠٪ سەرکەوتنی مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ زیرەکی ، ئەوە لە ٥٠٪ کەی دیکەی دەگەڕێتەوە بۆ جۆری کەسێتی ئەو مرۆڤە ، یان دەگەڕێتەوە بۆ ڕادەی خۆشەویستی ئەو مرۆڤە لە کۆمەڵدا ، مانای وایە لەپاڵ زیرەکیدا ، تێبك سووکی ئیبك قورسی ، بە زاتی ، ترسنۆکی ، یان شەرمنی ، دڵنەرمی ، دڵڕەقی سوری‌و بەردەوامی‌و کۆڵنەدان لە سەر بیروباوەڕ ، لە ئەنجامدانی پێویستی‌یەکانی سەرشانیدا ، یان بەرەڵایی‌و پشت‌گوێ خستن ، ئەمانە هەموویان دەور دەبینن لە سەرکەوتن‌و ژێر کەوتنی کەسێتی مرۆڤدا ، با ئەو مرۆڤەش زیرەك بێت ، لەمانە هەمووەوە بۆمان دەرکەوت کە تەنها زیرەکی بۆ سەرکەوتن بەس نی‌یە.

## ٤ ـ خۆش‌زمانی

یەکێکی دیکە لە مەرجەکانی کەسێتی ، خۆش زمانی‌یە بە ڕاستی زمان ڕەوانی بەهرەیەکی زۆر خۆشە بۆ مرۆڤ ئیتر ئەو مرۆڤە هەر کەسێك بێت‌و هەر پیشەیەکی هەبێت ، هەرچەندە زمان ڕەوانی بۆ هێندە پیشە دارێك بە مەرجێکی سەرەکی دا دەنرێت وەکو : پیاوانی ئاینی ، خوتبە خوێنەکان ، پارێزەرەکان ، پیشەی مامۆستایی ، پیاوانی

ڕامیاری ، سەرکردەکان ، یان نوێنەرانی گەل ، لە کۆنگرەکاندا ، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو گرنگیەشدا هێشتا بۆ پەرەسەندنی کەسێتی مرۆڤ ، ناوبانگ پەیدا کردنیو خۆشەویست بوون و ڕێز پەیدا کردنی ، بە مەرجێکی سەرەکی دانانرێت ، بەڵکو پلەیەی نزمی هەیە بە گوێرەی نیشانە باڵاکانی دیکەی کەسێتی .

لەم بارەیەوە دوو ڕاستی هەن پێویستە ئێمە چاویان لێ نەقوچێنین ، یەکەمیان : ئەوەیە هەر یەکێك لە ئێمە لە قسە کردندا لەوانی دیکە جایە ، چونکە هەمانە دەنگی ڕەوانە ، هەشمانە دەنگی زوڵاڵە ، هەشمانە دەنگی گڕە ، هەمانە دەنگی بەرزەو هەشمانە دەنگی نزمە ، هەمانە منگەو بەلووت قسە دەکات هەشمانە پیتە بزوینەکان زیاد لە پێویست درێژ دەکاتەوە ، هەروەکو چۆن هەندێکمان قسە دەنگلێنێتو هەندێك لە پیتەکان فووت دەدات ، یان کۆتایی هێندە ووشەیەکی ڕستەکان دەبڕێت .

هەندێکمان لە کاتی قسەکردندا لە شوێنی خۆیدا دەنگ بەرز ناکەینەوەو لە کاتی خۆیدا دەنگ نزم ناکەینەوە ، لە شوێنی پێویستدا توڕە نابینو لە شوێنی پێکەنیندا پێناکەنین ، ئەم جیاوازیە کە لە تێوانماندا هەیە ، تین دەکاتە سەر کەسێتیمان و کەسێتیمان جیاواز دەکات ، لەبەر ئەوە پێویستە تا دەتوانین خۆمان لە سەر ڕێكوپێك قسە کردن ڕابێنین ، پیتەکانی ووشەی ڕستەکان ، لە کاتی قسەکردندا بە باشی دەنگەکانیان ئاشکراو سایە بکەین ، بۆ ئەوەی سەرکەوتووبین لە ژیانی کۆمەڵایەتیماندا ، وەکو نـ پێشینان ووتویانە ( بە قسەی خۆش مار لە کون دێتە دەرەوە ) بەڵام نابێت ئەوەش لە بیر بکەین کە شیرین گوفتاریو زوبان لەباریو ووتە ڕەوانیش ، پێویستیان بە هەڵبژاردنی

باشترین ووشەو ڕیکترین ڕیز کردن هەیە .

دووەمیان : ئەوەیە کە کەم قسە کردنیش وەکو ( فەنەیێ دەنگە ) هەرچەند زۆر ناتەواوی مرۆڤ دەشاریتەوە بەڵام ئەگەر مرۆڤێك بیەوێت کەسێتی خۆی لە وتووێژدا دیاری بکات ، ئەوە پێویستی بە زمانێکی تەڕوو دەمو لێویکی پاراوو شارەزایی‌یەکی زۆر هەیە .

لە لایەکی دیکەوە پێویستە ئەوە بزانین کە زۆر بلێی‌ی‌و جەنەبازی‌و گاڵتەی زۆر کردن ، ئەمانە جێگەی زمان ڕەوانی ناگرنەوە ، چونکە کە لە سنوور دەرچوون کەسێتی ئەو مرۆڤە کەم دەکەنەوە ڕێزو سامی ناهێڵن ، لەبیرکردنەوەو داهێنانو چاوتێ برین دووری دەخەنەوەو دەی‌خەڵافێنن .

## ٥ ـ دڵپاکی :

زۆر کەس هەن مرۆڤی دڵپاکو سینەساف بە کەسێتی دار دادەنەن ، هەرچەند سیفەتی کینە بەری‌و رق‌گرتن لە کەسانی دیکە زارکێشانو حەز نەکردن بە بەرژەوەندی گشتی‌و تایبەتی کەسانی دیکە پێش‌خواردنەوەی زۆر ، چەند سیفاتو نیشانەیەکی زیان بەخشنو خراپن مرۆڤ سوكو ڕیسواو نابووت دەکەن ، لەپێش چاوی کەسانی دیکە نزمی دەکەنەوە تووشی چەندەها نەخوشی‌ی لەشی‌و دەروونی دەکەن ، لەگەڵ ئەمانەشدا دەروونزانی ، سیفەتی ( دڵپاکی ) یش بە نیشانەیەکی بناغەیی دانەناوە بۆ دروست بوونی کەسێتی‌یەکی باش ، چونکە چەندەها مرۆڤی دڵپاك دەبینین کە چەندەها مرۆڤی پیس‌و چەپەڵو زیانبەخش لە سایەیاندا دەحەسێنەوە بەردەوامن لە سەر خراپە ، هەروەکو ماروو دووپشك بە کەسانی ترەوە دەدەن ، یان بابڵێین وەکو سەگی

(نهێن‌گر) کـــەسانی پاك دەگـــەزن وەکو شاعیری بە ناوبانگی کورد پیرەمیرد دەڵێت :

**ساف دەروون داری دەستی بەدکارە**
**بۆیە شەرمدار باوە لەم شارە**
**هەروەها لە شیعرێکی تردا دەڵێت :**
**ئەو پیاوە گەورەی کە خۆش باوەڕە**
**بە دەست خەلکەوە مێکوتی ساوەرە**

بێجگە لەو نیشانانە چـەند نیشانەیەکی تریش هەن کە پلەی نزمیان بۆ دادەنرێت لـە دروست بوونی کـــەسێتی مرۆڤدا ، ئەوانیش وەکو لەش‌ساغی یەکی باش‌و ڕۆشنبیری‌یەکی بەرز ، وا دەردەکەوێت لـەبەر ئەوەیە چەند زانایەك واتای ڕۆشنبیری‌یان بەکردەوەی جوان‌و ڕەووشتی ڕێك‌و خوی پەسند لێکداوەتەوە ، نە وەك بە واتا نووسین‌و خوێندنەوە .

# نیشانە باڵاکانی کەسێتی مرۆڤ

لە لایەکی دیکەوە چەند نیشانەو سیفەتێکی بنچینەیی هەن بۆ دارشتن‌و هەڵچنین‌و دروستبوونی کەسێتی ، بونیان پێویستە ، جێگەیەکی گرنگ‌و پلەیەکی سەرەکی دەگرنەوە لە پەرەسەندن‌و گەشە کردنی کەسێتی مرۆڤدا ، ئەوانەش وەکو : ئەم نیشانانە : خۆنەپەرستی ، پڕ تەوی چالاکی ، زیرەکی ، وەفاداری ، دڵ فراوانی ، لێهاتوویی ، لێوەشاوەیی ، توانا‌داری ، جیهاندیدەیی ، کارامەیی ، شارەزایی ، بێ فیزی دڵسۆزی ، وورە بەرزی پاک‌و تەمیزی ، لە خۆو لە هاوڕێ‌و لە ناساو ڕازی ، هەوڵدان ، کۆڵنەدان خووڕەووشتی باش‌و جوان ، ئامانج‌و هیواداری ، دادپەروەری ، ڕاستبێژی ئەو کەسە پشت بە خۆبەست بێت ، هەست بەڵێ پرسینەوە بکات ، بە ویژدانی ، باوەڕی هەبێت بەو هیواو ئامانجانەی کە بۆ خۆی هەڵی بژاردوون ، هەستی کۆمەڵایەتی هەبێت ..

**ئێستا تۆزێک بە درێژی باسی هەندێک لەم نیشانە باڵایانە دەکەین:**

## ١ ـ هەستی کۆمەڵایەتی

نیشانەیەکی باڵای کەسێتی بەهێزە ، هەر مرۆڤێک هەستی کۆمەڵایەتی هەبێت ، دەبێتە کەسێتی‌یەکی ئاشکراو دیارە

ئەو کەسانەی کـە هەستی کۆمەڵایەتیان تێدا بەهێزە ، دەیان بینین زۆر سەرکەوتوون ، گەیشتونەتە بەرزترین پلەی کۆمەڵایەتی  لەگـەڵ ئەوەشدا زۆر لەم کەسانە پلەی زانیاری‌یان‌و پلەی زیرەکیشیان نزمـەو بەرز نی‌یە • واتای هـەستی کۆمەڵایەتی لـە مرۆڤدا ئەوەیە کـە ئەو مرۆڤە ، داناو لێزانە ، ڕەووشت‌و کردەوەی ڕێك‌و جـوانە ، وتەی شیرین‌و قسەزانە ، ئەم جۆرە کەسانە یەزدانی گەورە ، تواناو بوەیـکی وای داوە پێیان ، کـە دەچنـە ناو کۆمەڵێکەوە ، یان دانشتێکەوە دەزانن چۆن قسە دەکەن • کـەی قسە دەکەن ، کەی گوێ دەگرن ، کـەی بەڕوی خەڵکەوە پێدەکنن ، کـەی پیایاندا هەڵدەکاڵن ، کـەی قسەی ڕەق دەکـەن ، کەی توڕە دەبن و کـەی ڕویان خۆش دەکەن ، کـەی بە بەزەیی دەبن‌و ، کەی بێ بەزەیی دەبن •

هەروەها دەتوانن کە چۆن دەچنە قووڵایی دەروونی ئەو کەسانەوە کـە وتووێژیان لـە گەڵ دەکەن ، بۆ ئەوەی کـە بەیەکدا نەتەقنەوە ، لـە قسەی یەکتر هەڵنەبەزنەوە • ئەمجا بۆمان هەیە کە لێرەدا بپرسین ئەو کەسانە ، ئەم توانا بەهێزەیان چۆن پەیدا کردووە ؟

لە وەلامدا دەڵێن  هەستی کۆمەڵایەتیش بریتی‌یە لەوەی کـە ئەو کەسە لە ناو جەرگەی کۆمەڵەوە پەروەردە بووەو گـەشەی کردووەو هەڵقولاوەو دروست‌بووەو پێ‌گەیشتووەو گونجـاوەو ناسیاوی دۆست‌و پیانەی پەیدا کردووە •

بە کوردی دەڵێن : لە گەلەو ڕۆڵەی گەلە •

ئەو کەسانەی کـە هەستی کۆمەڵایەتیان تێدا بەهێزە ، دەتوانن بە ئاسانترین ڕێـگەو ، بە ئاسایی ترین شێوە ، بە بێ شـەرم‌و شکۆ ، بەبێ ئەوەی کـە هەست بە ئاوارەیی‌و نامۆیی بکەن ، لەگەڵ کەسانی دیـکەدا

بگونجێن ، بیان ناسن‌و بیان ناسن ، یەکتریان خۆش بوێت ، هۆگری یەکتر بن ، ڕوو لـە یەککەن‌و یارمەتی یەك بدەن •

بە ڕاستی ئەم دەستکەوتەو ئەم بەهرەیە خوا بـە هێندە کەسێکی نەداوە ، بۆ نموونـە :

لەو کەسانەدا نابینیتەوە کـە تووشی نەخۆشی ( گرێی کەمـەری ) بوون ، یان لـەو کەسانەدا نابینیتەوە کە خۆیان لە هەموو کـەس بـە گەورەترو ڕەسەنترو خانەدانترو نەژادترو هەلکەوتووتر دادەنێن •

هەروەها لەو ڕۆشنیرانەدا بەدی ناکرێت کـە تازە دەگەڕێنەوە بۆ هۆزەگەری‌و ، تیرەگەری ، لەباتی نیشتمانپەروەری‌و نەتەوەپەروەری ، یان ئەم بەهرەیە لای ئەو کەسانە ناگیرسێتەوە کە خۆیان لە هەموو کەسێ بە زیرەکترو بلیمەترو لێزانترو ووریا ترو چوست‌و چالاکتردا دەنێن ، بەدەوری خۆیاندا دەسوڕێنەوەو ڕەو دەرناکەن بۆ ناو جەماوەر ، بەلکو لە جوارچێوەیەکی تەسك‌و تاریکدا دەژین ، هـەر وەکو قوتـەی بن دارەکە ، هەمیشە قوژبن‌و کەنار دەگرن •

## ٢ ـ خۆ نەپەرستی

کارێکی ڕوون‌و ئاشکرایە ، کە خۆبەرستی‌بە سیفەتێکی بێزراوی مرۆڤ دادەنرێت ، بەلام خۆنەبەرستی بە نیشانەیەکی بالای کـەسێتی مرۆڤ دادەنرێت ، چونـکە ئەم نیشانەیە لـە هەر کەسێکدا هـەبێت ، ئەوە واتای وایە هەست بەلێ‌پرسینەوە دەکات ، دەست گیرۆدەیی‌و گیانی یارمەتی‌و گیانی هەرەوەزی تێدا هەیە ، مرۆڤێکی بەویژدانە •

بە ڕاستی خۆ نەبەرستی یەکێکە لەو نیشانە بالایانەی کە کەسێتی مرۆڤ بەرز دەکەنەوەو ناوبانگی پێ پەیدا دەکەن‌و خوشەویستی دەکەن،

چونکە ئەم نیشانەیە دژی خۆپەرستی‌و چرووکی‌و پوولەکێتی‌یە ، دژی گۆشە گری‌و دوورە پەرێزی‌و کەنار گرتە •

با بزانین بنچینەی بەرزی ئەم سیفەتە لە سەر چی بنچی داکوتاوە ؟

بنچینەی خۆنەپەرستی لە سەر بەهێزترین‌و پاکترین‌و شیرینترین بنچینە ڕەگی داکوتاوە ئەویش سۆزی خۆشەویستی‌و گیانی چاکەکردن‌و بەخشینە ، بەلام کام خۆشەویستی ؟ خۆشەویستی منداڵ ، خۆشەویستی هاوسەرو خێزان ، خۆشەویستی هاوڕێ‌و دەروو دراوسێ ؟

ئێمە دەزانین کە خۆپەرستی سیفەتێکی منداڵانەیە ، واتە ئەم سیفەتە لە تەمەنی منداڵیدا زۆر بەهێزە ، کاتێك کە منداڵ چاو دەبڕێتە ئەو شتانەی تەنها پێویستی‌یەکانی جێبەجێ دەکات‌و بەس ، بەلام منداڵ کە بەرەبەرە گەورە بوو ، بەرەبەرە خۆپەرستی‌یەکەی کەم دەبێتەوەو لاواز دەبێت‌و دەگۆڕێت بە خۆنەپەرستی •

با بزانین لە چ قۆناغێك لە قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ ، نیشانەی خۆنەپەرستن دەست بەگەشە کردن دەکات ؟

بە ڕاستی سەرەتای گەشە کردنی خۆنەپەرستن لە نیزیك سەرەتای تەمەنی لاوی یەوە لە قۆناغی هەرزەکاری‌یەوە دەست پێ دەکات‌و بناغەی ئەم گەشە کردنەش ، سەرەتای خۆشەویستی تۆخمی‌یە ، چونکە منداڵ لە سەرەتای ژیانێوە خۆپەرستە ، بەلام کە وردە وردە گەورە بوو تێکەڵاوی کۆمەڵی کرد بیری لە هاوسەر بوون کردەوە ، واتە بیری لە ژنهێنان کردەوە ، ئەگەر کوڕ بوو ، بیری لە شووکردن کردەوە ، ئەگەر کچ بوو ، ئەو کاتە لە خۆپەرستی یەوە باز ئەدات دەگۆڕێت بۆ خونەپەرستی •

هەندێك لـە زاناکان دەڵێن مرۆڤ کە تەمەنی گەیشتە نزیکە (٢٠)بیست ساڵان ، خۆی دەڕازێنێت‌و ڕەنگی بە خۆی دەدات‌و ڕوخسارو قەڵافەتی خۆی جوان دەکـات ، کردەوەو ڕەفتاری ڕێك‌و پێك دەکـات ، بۆ ئەوەی کـە سەرنجی توخمی دیـکە بۆ لای خۆی ڕاکێشێت ، لەمەوە بەرەبەرە خۆبەرستی‌یەکەی نامێنێت ، و کـە ژنی هێناو ، یان شـــووی کردو منداڵی بوو ئەو کاتە نیشانەی خۆنەبەرستی زیاتر پەرە دەسێنێت‌و دەگۆڕێت ، تا وای لێدێت کە گەورە بوو نامێنێت •

ئەمــە ئەوە ناگەیەنێت کە تەنها خوشەویستی دڵداری یان پەیوەندی توخمی ئەم نیشانەیە بجوڵێنێت‌و پەرەی پێبدات ، بەڵــکوو هـــەموو خوشەویستی‌یەك ، ئەم ئەرکە دەبینێت ، وەکوو خۆشەویستی‌و پەیوەندی منـداڵ بە دایکیەوە •

تا بەم شێوەیە ئەو گەنجانە کـە خۆبەرستی‌یەکەیان نەما ، کەســانی تریشیان خۆش دەوێت ، سۆزی نەتەوایەتی‌و نیشتمان پەروەریشیان تێدا دروست دەبێت ، گیانی قوربانی‌و خۆبەخت‌کردنیان تێدا پەرە دەسێنێت‌و گەشە دەکات ، ئامادە دەبن کە خۆیان‌و سامانیان بەخت بکەن ، لە ڕێگەی بیرو باوەڕی پیرۆزداو زیاتر گوژم دەدەن‌و خۆیان ماندوو دەکـەن ، بۆ گەلاڵە کراوی چاك‌و ئاڵوگۆڕی گشتی نەتەوایەتی •

لێرەدا بۆمان هەیە پرسیارێك بکەین‌و بڵێین : ئایە هەموو لاوێك لە سیفەتی خۆبەرستی رزگاری دەبێت ؟

لـە وەڵامدا دەڵێن نەخەیر ، زۆر لە منداڵان کە گەورەش دەبن خۆبەرستی منــداڵیان تێدا هــەر دەمێنێتەوە ، لـەبەر ئەوە دەیان بینین بێبەزەیین ، هەست بەلێپرسینەوە ناکـەن ، هەرچی کارێك بەرژەوەندی

خۆیان‌و قانزاج‌و دەستکەوتی خۆیانی تێدا نەبێت ، پەسندی ناکەن‌و بەلاەاری نادەن ، نیشتمان‌پەروەری‌و نەتەوایەتی‌و چاکەو پیاوەتی ، بەلای ئەوانەوە لەو کارانەدایە ، کە قانزاج‌و بەرژەوەندی ، خۆیانی تێدا هەیە ، ئەگینا ، نەء .

هەندێکیان هیچ پرۆگرام‌و نەخشەیەکی ڕامیاری‌و دارایی‌و ڕۆشنیری‌و کۆمەلایەتی‌یەکیان ، لە مێشکدا نی‌یە ، ئەوە خوێندنەوەی پەرتووك‌و گۆڤارو ڕۆژنامە بەلای ئەوانەوە نرخی نی‌یە لەبەر ئەوە ئەو ڕۆشنیری‌یەی کە هەیانە ، بەرە ناسێنێت‌و ، لە دۆخی خۆیدا دەمێنێتەوە ، لە کاروانی ڕۆشنیری ، ڕەوتی زانیاری ، دوا دەکەوون ، کاتێك دەزانن لە هاومالّی پشەو زانستی بەجێماوون .

هەندێکیان ئەگەر بۆی ڕێ بکەوێت‌و فەرمانێکی میری باشی بێ بسپرێت ، بەرژەوەندی یەکی گشتی بدرێتە دەست ، پێش هەموو شتێك ، بیرد دەکاتەوەو نەخشەیەك دەکێشێت کە چۆن زوو پێ‌بگات‌و پارەو سامانێکی باش پێکەوە بنێت‌و بێتە پیاو ئەو کاتە هەوڵ دەدات ئەو فەرمانبەرانە لە خۆی کۆ بکاتەوە ، کە نهێنی‌و کارە ناهەموارە کانی بپارێزن‌و بلاّویان نەکەنەوە ، ئەمانەش یان خزمین ، یان هەر وەکو ئەو خۆپەرست‌و چەوتن ، لە سەر سکی چین ،و زۆربەی جەماوەر ، پێدەگەن .

هێندێك لەو گەنجانە هەر بە یەکجاری نیشانەی خۆبەرستی‌یان تێدا دەچەسپێت دەیان بینین ژن ناهێنن‌و بەرەبەتی دەمێننەوە ، یان دەگەڕێن بە شوێن ئافرەتێکی ساماندارەدا یان مەرجیان ئەوەیە کە دەبێت ئەو ئافرەتە سامانێکی زۆرو مووچەخۆریش بێت . با هیچ سفاتێکی دیکەی

تیـدا نەبێت ، زۆر لەم جـــۆرە کەسانە زیانی هاوسەریان لە ئاژاوەو مشتو مڕدا بەسەر دەبەن تاکۆچی دوایی دەکەن •

## ٣ ـ خزمەت گوزاری

بە ڕاستی خزمەتگوزاری ، پلەیەکی لەپلە باڵاکانی کەسێتی بانی گرتووە بەڵکو زۆر لـــە زاناکان دەڵێن مـەبەستی ڕاستیو ئامانجی کەسێتی باش ، تەنها خزمەتکردنو هەڵسوراندنو بـــە ڕێوە بردنـی کاروبارو یارمەتی دانی کەسانی دیکەیە ، بەڵکو کۆمەڵی جەماوەریش بە لایانەوە وایە کە مرۆڤی بە کەسێتی تەواو ، ئەو کەسەیە کـــە بتوانێت خزمەتی خۆیو خزمەتی کەسانی دیـکەشو کەسانی دڵسوزی نەتەوەو وولاتەکەی بـکات •

بە ڕاستی توانا لەســەر خزمەتی تایبەتیش هەر بە پلەیەکی بەرزی کەسێتی دادەنرێت ، چونکە هەر کەسێك نەتوانێت خزمەتی خۆی بکاتو کەڵكو بەرهەمی نەبێت ، ئەوە واتای وایە ناتوانێت خزمەتی گـــەلو نەتەوەکەشی بـکات وکەڵـکی بۆ نیشتمانەکەشی هەبێت ، لەبەر ئەوەیە کـە کاتێك ئێمـە یارمەتی هاوڕێیەکمان دەدەینو گیروگرفتی ناسیاوێك یان نەناسێك لا دەبەین ئەوە واتای وایە زیاتر تێکەڵاوی بـە کومـەڵەوە دەکەین شارەزایی پەیدا دەکەین ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئێمـە چەندێك یارمەتی کەسانی دیکە دەین ئەوەندەش یارمەتی خۆمان دەدەین •

ئێمـە لە ڕێـگەی کەسانی دیکەوە هەست بە بوونو تواناو لێهـاتنی خۆمان دەکەین و تێکەڵاوی زۆر تر دەکەینو ڕێزو نرخی خۆمانیش لـە چاو کۆمەڵدا بەرز دەکەینەوە وەکو ووتمان خزمەتی گشتیش بە ئەوبەڕی بەرزی پلەی کەسێتی دادەنرێت بەتایبەتی ئەگەر لە خۆوە بێتو دەست

پێشکەری تێدا هەبێت ، بە بێ ئەوەی داوا لەو کەسە بکرێت ، چونکە مرۆڤ خۆی تەرخان ناکات بۆ خزمەتی گشتیو قوربانی بەخۆیو ماڵی نادات ، ئەگەر شۆڕشێکی دەروونی لە ناخیدا دژی خۆپەرستی ، بەرپا نەبێت هەڵنەگیرسێت ، بۆیە نیشانەی خزمەتگوزاری بە بەرزترین لوتکەی کەسێتی دادەنرێت ، ئەوەندە بەرزە نیشانە نرمەکانی کەسێتی وەکو جای باشو زمانی تەڕو پاراوو لەشولار ، هەموو دەشارێتەوەو دەیانخاتە پێچە کەنووەوە .

## چەند نموونەیەك بۆ مرۆڤی خزمەتگوزار

١-٣- ئەو کەسەی کە ڕێگەوتێك دروست دەکات یان نەخۆشخانەیەك یان قوتابخانەیەك ، یان گەڵاڵە کراوێکی بە کەڵك ، یان ئەو کەسانەی دەبنە هۆی دروستکردنی ئەم جۆرە بەرهەمە بە کەڵکانە، ئەمانە بێجگە لەوەی کە لای یەزدان پاداشتی باشیان هەیە ، بەڵام لای ئەندامانی کۆمەڵ کەسێتییان بەرزەو هەتا هەتایە ناویان دەمێنێتەوە ، تۆ بەراووردی کەسێتییە بەناوبانگەکان بکە لەگەڵ کەسێتی ئەو خازەن سامانانەی کە دوای خۆیان سامانەکانیان بەفیڕۆ دراوەو دوای خۆیان کەس ناویان بە باشی بە چاکی نابات .

٢-٣- نموونەیەکی دیکە بۆ خزمەتگوازی هەڵگرتنی لێپرسینەوەیە ، نمونەی ئەمەش ئەوفەرمانبەرا نەیەکە حەز بەهەڵگرتنی لێپرسینەوە یان حەز بە کاربێ سپاردنی زۆر دەکەنو فەرمانی زیاتر دەخەنە ئەستۆی خۆیانو دەیش توانن بیانبەن بە ڕێوەو ئەنجامیشیان بدەنو بەم جۆرە ، خزمەتی دانیشتوانی وولاتەکەیان بکەن .

٣-٣- زۆر هۆی دیکە هەن لە ژیاندا ، بە خزمەتگوزاری

دادەنرێن‌و نرخی مرۆڤ لە کۆمەڵدا بەرز دەکەنەوە ، بۆ نموونە : مرۆڤی هاوسەردار کەسێتی بەهێزترە لەو مرۆڤانەی بەرەبەتی دەبینەوە ، لەبەر ئەوە ئەو گەنجانەی کە زووتر ژن دەهێنن‌و هەوڵی پێکهێنانی خێزان‌و منداڵ دەدەن ، بە کەسێتی تردا دەنرێن •

٤ـ٣ـ هەروەها ئەو مرۆڤانەی کە کار دەکەن‌و هەوڵ دەدەن ماڵ‌و منداڵیان بە ڕێك‌و پێکی بەڕێوەبەرن منداڵەکانیان بە جوانی‌و بە باشی بەخێو بکەن‌و بیان گەیەننە باشترین ئامانج‌و فێری باشترین پیشەو کاریان بکەن ، چونکە کار کردن جۆرێکە لە خزمەتگوزاری ، بەڵام ئەو کەسانەی کە کارێك ناکەن‌و هەوڵ نادەن تەمەڵ‌و بێ‌کار دادەنیشن‌و بە سەرسکی کەس‌و کاریانەوە ، یان بە سەر سکی ئەم ئەوەوە دەلەوەڕێن بێ‌گومان ئەمانە لەپێش چاوی کەسانی دیکە سوك و نزم‌و کەسێتی‌یان لاوازە •

٥ـ٣ـ گۆڕینی باری ژیان یەکێکی دیکە لە جۆری کەسێتی بەهێزکردن‌و خزمەتگوزاری گۆڕینی باری ژیانەو گەشەپێ کردنێتی ، بە پێی پێویست‌و قابیل نابن بەکەم‌و بە دەستەو وسانی‌و تەمەڵی ، بەڵکو هەمیشە هەوڵ دەدەن باری ژیانی خۆیان بگۆڕن لە خراپەوە بۆ باش ، لە باشەوە بۆ باشتر ، بۆ ئەوەی ژیانێکی باشتر بگوزەرێنن وبەپێی چەرخ‌و زەمانە خۆیان دەگۆڕن ، ئەگەر زانیان کارەکانیان وپیشەکانیان باری نەماوە دەی‌گۆڕن بە کارو پیشەیەکی باش‌و بە ڕەواج ، ئەگەر زانیان کە ئەو زانیاری‌و ڕۆشنبیری‌یەی هەیانە بەرەو کۆن بوون‌و کزبوون دەچێت بە گوێرەی زانیاری‌و ڕۆشنبیری نوێ داهاتوو ئەوە دەخوێننەوەو دوای کاروانی ڕۆشنبیری نوێ دەکەوون ، بەداخەوە دەڵێم زۆر کەس لە ئێمە هەن دوای ئەوەی کە قوتابخانە و زانستگەکانیان تەواو کردووە

هیچ جۆرە پەرتووكو گۆفارێکیان نەخوێندۆتەوە بە دوای هیچ جـۆرە رێـگەو ئامرازێـکی نوێدا نەگەڕاوون بۆ پێش‌خستنی پیشەکانیـــان و پەرەپێدانی شێوەی ئەنجامدانی فەرمانەکانیان •

## ٤ ـ ئامانجو هیواداری :

یەکێکی دیـکە لەو نیشانانەی کە کەسێتی مرۆف بەهێز دەکـەنو ناوبانـگی پێ پەیدا دەکـەن ، ئەوەیە کە پێویـستە مرۆف لـە ژیانیـدا ئامانجو هیوایەك بۆ خۆی دیاری بـکاتو نەخشـەو پلانێکیان بۆ بکێشێت ، چونـکە مرۆفی بێ هیواو ئامانج وەکو دارێك وایە کـە گیانی تێـدا نەبێتو ووشك بێت ، باشترین رێـگە بۆ مرۆڤێکی ئاسایی کـــە بیەوێت پەیبەدنی ئەم خاڵە بکات ، ئەوەیە کە چاو لە کەسێتی یە ناودارەکـــان بـکات ، سیفەتو کردەوەی مرۆڤە هەلکەوتووەکان لەخۆیدا بڕسکێنێتو پەیڕەوی ڕێڕەوی مرۆڤە سەرکەوتووەکان بکات خۆی بە خاوەن پەیامێك دابنێت چەند ئامانجو هیوایەکی بەسوود لەپێش چاوی خۆی ڕەچاو بکات، هەوڵو تەقەلا بدات کە بەدییان بهێنێت ، بۆ ئەوەی کۆمەڵو نەتەوەکـەی کەڵـکی لێ وەرگرن •

وەکو : بەرهەڵستی کردن لـە بیرو باوەڕی کۆمەلایەتیو ڕامیاریو ئابوری بێفەڕ ، بەرهەڵستی کردن لە جۆرەکانی بەندایەتیو ژێردەستەیی بەرهەڵستی کردن لـەو بیروباوەڕانەی کـە دەبنـە هۆی دواکـەوتنی بیـــری ڕوونی نەتەوایەتیو نیشتمان پەروەری کوردەواریمان ، ئـەو بیروباوەڕانەش وەکو : تیرە گـەری تەسك و هۆز پەروەری تەنـگ ، دواکەوتنو نۆکەری بێانە چونـکە ئەمانە دەبنە هۆی پچڕپچڕبوونو پەرتو بڵاوی باری نیشتمـــانیو نەتەوەییمان ، ولاواز بوونی بـــاری کۆمەڵایەتیمان ، وەکو : پەندە کوردییەکە دەڵێت :

ماڵ لە خۆی نەبوو میوانیش ڕووی تێ دەکرد •

ئێستا ئێمە بە چاوی خۆمان دەبینین ، چەند کەس لە لاوەکانمان لە مەیدانی جەنگدا شەهید دەبن لەڕێگەی مافەکانی گەلەکەمانو نیشتمانەکەماندا دەکوژرێن و خوێنی گەشیان دەڕژێت لە لایەکی دیکەوە دەئەوەندە زیاتر لە ڕێگەی هۆزەگەری و دوشمنایەتی تیرەگەریدا دەکوژرێنو لە خوێنی خۆیاندا دەگەوزێن بە بێ گوناه هەتا وای لێهاتووە ئەم بیروباوەڕە دواکەوتووە ڕێڕەوو ئەنجامی پارتە ڕامیاری‌یەکانیشی تێکداوە ، زۆر لە ئێمە هەرچەند پێش‌کەوین لەبارەی خوێندەواریو ڕۆشنیری‌یەوە ، ناتوانین خۆمان رزگار کەین لەو بیروباوەڕە تەسکانە بچینە نێو گۆڕەپانی نەتەوایەتی ، نیشتمانپەروەری‌یەوە • زۆر کەس هەن ، هێندێ لایەن هەن هانی مانەوەو بوژانەوەی ئەو تیرەگەریو هۆزەگەری‌یانە زیاتر دەدەن لەبەر پاراستنی بەرژەوەندي تایبەتی خۆیان ، بەش بەش‌کردنی نەتەوەکەمان ، پێویستە لە سەرمان ڕووپۆشی ناپاکی لە سەر بڕواو نیازی ئەو جۆرە کەسانە هەڵماڵین ، بە هۆی بڵاوکردنەوەی خوێندەواریو ڕۆشنیریو بیروباوەڕی نەتەوایەتیو نیشتمان پەروەری ، بڕ خێرو بڕ فەڕو بەرەکەت •

## نیشانەکانی کەسێتی باش لە کۆمەڵی کوردەواریدا

بەڕاستی ڕادەی بەبرەوی‌و بەرەواجی زۆر لە نیشانەکانی کەسێتی مرۆڤ لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیکە جیاوازی یان هەیە ئەم گۆڕان‌و جیاوازی‌یەش لای هەر کۆمەڵێك ، وابەیوەستە بە چەند هۆیەکی مێژوویی کۆمەڵایەتی‌و ژینگەی تایبەتی‌یەوە ، بۆ نموونە: نیشانەی ئازایی‌و جەنگاوەری ، کە لای مرۆڤێکی کورد بە نیشانەیەکی بالا دادەنرێت ، ئەو پلە بالایەی نادرێتێ لە ولاتەکانی ئەوروپادا یان بابلێین شێوەو جۆری ڕەنگەی ئازایی دەربڕینێکە کە دەگۆڕێت ، هەروەها نیشانەی بەخشندەیی بە نیشانەیەکی بەرز دادەنرێت ، لە کوردستانی ئێمەدا بەلام لە زۆر وولاتی دیکەدا ئەو پلە بەرزەی نادرێتێ ، هەر لەبەر ئەوەیە گەلی کوردمان بە شێوەیەکی گشتی چەند نیشانەو سیفاتێکی کەسێتی تایبەتی هەیە جیای دەکەنە وە لە گەلەکانی دیکە .

ئێمە لە کاتێکدا کە مێژووی گەلی کورد(٩) دەخوێنینەوە ، دەبینین زۆربەی زۆری ڕۆژ هەلاتناس‌و گەڕیدەکان ، دانیان بەوەدا ناوە کە کوردەکان وەکو گەلێك بە شێوەیەکی گشتی ، باشترین نیشانەی کەسێتی دەپەسەندن ، وەکو سوارچاکی ، ئازایی ، جەنگاوەری ، بەویژدانی ، بەتەوانایی ، لەسەرخۆیی هتد ....

---

(٩) باسیل نیکیتین ـ الاکراد ـ ط (١) دار الروائع ١٩٦٧ في بیروت ص٥٠ .

مێجەرسون دەڵێت[1] کورد هەمیشە بەجەرگە ، قارەمانە .

مامۆستا هادی رشید چاوشلی دەڵێت: کەسێتی کوردی گیانی یارمەتیدانو هاوکاری زۆرە ، بەتایبەتی لەگەڵ خزمو کەسو کاریدا ، هەروەهـا دەڵێت[2] : کەسێتی کوردی ڕێزی پیرو بەساڵاچووان زۆر دەگرێت هەروەها دەڵێت کەسێتی کوردی هەمیشە بەستراوە بە خوو ڕەووشتە کوردی یە پەسندەکانەوە و وازیان لێ ناهێنێت،بالەدەرەوەی کوردستانیشدا بژی ، ئەم نیشانەیەش یەکێکە لەو نیشانانەی کە نایەڵێت بتۆێتەوە .

دروست بوونی ئەم نیشانە کەسێتی یە باشانەش ، کارێکی کتوپڕی نەبووە لـە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا دروست نەبوون ، وادیارە لـەبەر ئەوەیە کـە جۆری ژیانی باووباپیرمان لـە ژینگەیەکی سەختو گیروو گرفتاویدا بووە ، تا ئێستـەش ژینـگەیەکی ڕەهێڵاویو سەهۆڵاویو تووشو تـەوژم دارو چڕو دارستانی پڕپیشـە وگیـانی لەبەرو چڕو جـانەوەرانمان هـەیە ئەمـە لـە بارەی سروشتەوە لە لایەکی دیکەوە فەڕوبەرەکەتو بەرهەمداریو ساماندارییو دیمەنو جوانی شاخەکـانی کوردستان ، وایان کردووە ، کـە بەرچـاو بـکەونو سەرنجی گەلانو نەتەوەکانی دەوروبەریان ڕابکێشن ، داگیرکەران چاو ببرنە وولاتەکەیانو تەماعی تێبـکەن و هـەول بدەن داگیری بکەن ، ئەمانیش زۆریان بۆ هاتووە کـە بەربەرەکانی لێ بـکەن هەوڵ بدەن کـە داگیرکەرەکان دەرکـەن ، ئەمجا بۆیە ئەم سیفاتە باشانەیان تێـدا چەسپیوەو پەرەیان سەندووەو ناوبانگی بێ پەیدا کردوون ، بە جۆرێکی ئاوەها کـە زۆر نە

---

(1) رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين وكردستان ـ تاليف ميجرسون ترجمة فؤاد جميل ـ مطابع الجمهورية ـ بغداد ١٩٧٠

(2) الحياة الاجتماعية في كردستان ـ تاليف هادى رشيد الجاوشلى مطبعة الجاحظ ـ بغداد ١٩٧٠ ص٦ ، ٨٤ ، ٨٥ ، ٨٦ .

میژوو نووسەکان ڕایان وایە کە ووشەی (کورد) لە گوردەوە هاتووە ، واتا چوست و چالاك و ئازا . هەر ئەم نیشانانە بوون ، کەسێتی کوردیان ئەوەندە بەهێز کردووە ، بتوانێت خۆی لە چەقی لافاوی داگیرکەراندا ڕاگرێت و نەتاوێتەوە وبیان توێنێتەوە لە گەرووی خۆیدا ، یان ڕاکەن و بسکەڕێنەوە .

بەڵام سەرسوڕمان لەوەدایە(١٠) کە هەندێك لەو نووسەرانە ڕایان وایە کە گەلی کورد بۆیە ناتوانێت بگاتە ڕیزی گەلانی دیکە ، چونکە ناتوانێت کەسێتی خۆی بگۆڕێت و بەرگی هۆزەگەری و تیرەگەری تەسك و تروسك ، لە بالای خۆی داماڵێت .

گەورەترین هۆی ئەمەش ناحەزەکانێتی ، کە تەگەرە دەهێننە ڕێگەی ، لەم کارەدا هەرچی چۆنێك هەبێت ڕۆژگار دەیزانێت .

هەرچی چۆنێك هەبێت زۆربەی زۆری نیشانەکانی کەسێتی مرۆڤی کورد جێگەی ستایش و بەگەن کردنی ئەو گەریدەو ڕۆژهەلات ناسانە بووە ، بەڵێ ئەوە واتای وا نی یە کە هیچ کەسێکی کورد ئەو نیشانانەی تێدا نی یە کە کەسێتی لاواز دەکەن ، بەشکو کۆمەڵی کوردەواری ئەو نیشانانەی بەدی کردووە لە زۆر ئەندامەکانیدا بەلام بە شێوەیەکی گشتی لێیان ئاڕازی بووە .

ئەمجا گرنگترین ئەو سیفاتانەی کە مرۆڤ ناشیرین دەکەن و کەسێتی یەکەی لاواز دەکەن ئەمانەن

---

(١٠) المصدر السابق ص٦٣ .

**ترسنۆكی ، ڕووله‌كێتی ، ناپاكی ، لوت‌بەرزی (فیزلی) ، دەست چـــەپەلی ، زوبان‌پیسی ، خۆپەرستی ، زووتوڕەبوون ، ڕووشـــكێنی داوێن‌پیسی ، •• هتد ••**

خراپترین ئەو سیفاتانەی كەسێتی مرۆڤ لاواز دەكەن ، ئەوانەن كە زیان بەخش ترن یان زیان بە كەسەكەو بە كۆمەڵیش دەگـەیەنن وەكو :

**ڕووله‌كێتی ، ناپاكی داوێن‌پیسی •• هتد ••**

## پەسندترین نیشانەی کەسێتی لە کۆمەڵی کوردیدا

**پەسندترین نیشانەی کەسێتی لە کۆمەڵی کوردیدا ئەمانەن :**

**ئازایی ، بەزاتی ، جوامێری ، ڕێزگیری ، لێبوردوویی ، وەفاداری، سەرڕاستی ، ڕاستگۆیی ، حەقوازی ، ئازادی خوازی ، دادپەروەری ، بەبەزەیی ، نیشتمانپەروەری ، کوردپەروەری ، خۆبەختکاری ، خۆنەپەرستی ، دڵسۆزی ، بە ئابڕوویی ، بەشوورەیی ، داوێنپاکی ، دەست پاکی ، زمانپاکی ، میوانپەروەری ، بێفیزی ، بەوێژدانی ، لەسەرخۆیی ، ڕووخۆشی ، بەتەبایی ، هاوتایی ، گیانییارمەتی ، قسەخۆشی ، نوکتەبازی ، ڕەووشتجوانی ، ڕۆشنبیری ، جیهاندیدەیی ، شارەزایی کارامەیی ، سنگفراوانی ، بەپشوویی ، دووربینی .**

یەکێك لە نیشانەکانی کەسێتی سەرکەوتوو ، لە کوردەواریدا ، ڕێزگرتنی ئافرەتە ، واتا ئەو کەسەی کە ڕێزی ئافرەت ، دەگرێت ، سەربەستی لە سنوورێکی تایبەتیدا ، دەداتێ ، لە چاوی کەسانی دیکەدا گەورە ، و خۆشەویست ، و بە کەسێتی دەبێت .

خوێنەری هێژا ، ئەگەر لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤە کەسێتیدارەکان وورد بینەوە ، و لەبارەی ژیانی پیاوە بەناوبانگەکانی کورد بخوێنینەوە ، دەبینین سەربەستییەکی زۆریان بە ئافرەت داوە ، پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتییان بە هاوسەرەکانیان داوە ، لەم بارەیەوە ئەو نوسەرە

بیانانەی کە لە بارەی کوردەوە ، نوسیویانە ، ئیتر مەبەستیان باش بوبێت ، یان مەبەستیان خراپ بوبێت لە زۆربەی نوسینەکانیان ، پەنجەیان ، بۆ ئەم راستی یە ڕاکیشاوە ، و ووتویانە ئافرەتی کورد پەچەو ڕوپۆش ناپۆشێت ، مێردەکەی پشتی پێدەبەستێت ، باوەڕی پێدەبێت ، سەربەستی دەداتێ ، لەبەر ئەوە کە لە ماڵ نەبوو پێشوازی میوان دەکات ، و خواردن و خۆراکی بۆ ئامادە دەکات لە دیوەخاندا لەگەڵی دادەنیشێت ، هەروەها ، هاوکاری پیاو دەکات ، لەئەنجامدان و جێبەجێ کردنی کارەکانیدا ، چەندەها ئافرەتی کورد هەبون ، وەکو پیاو وولات ، یان شار ، یان گوندیان بەڕێوە بردووە ، بە بێ ئەوەی هیچ ئەندامێك لەو کۆمەڵەدا ، لە دانشتوان بەر هەڵستیان بکەن ، یان ئەم کارەیان بە لاوە ناخۆش بێت ، نموونە بۆ ئەم ئافرەتانە زۆرە ، ئەدەوندز(٣) دەڵێت دانشتوانی چەند گوندێك لای ڕەواندوز ( فاطمة خانم ) یان هەڵبژاردو دایانا بە نوێنەری خۆیان کە لەباتی ئەوان دەنگیان بۆ بدات ، لە هەلبژارندا ، لە کاتێکدا کە یاسای هەڵبژاردنی کاتی پاشایی دانی بە دەنگدانی ئافرەتدا نەنابوو ، ئەم ئافرەتە دوای کۆچی دوایی کردنی مێردەکەی ، ئەم گوندانەی بەڕێوە دەبرد • ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هەڵکەوتنی ئەم جۆرە کەسێتی یانە لە ئافرەتی کورددا ئازایەتی یەکەی دەگەڕێتەوە ، بۆ پیاو ، بۆ ئەو نەریت ، و خووڕەووشتانەی پەروەردەی کردوون ، چونکە ئەگەر مێژووی ژیانی ئەم جۆرە ئافرەتە ناودەرکردوانە بخوێنینەوە ، دەبینین یان خێزانی کەسێتی یەکی بەهێز و سەرکەوتوون یان کچین ، یان خوشکین ، قەت نەبووە هاوسەری پیاوێکی کەسێتی نەرم ، یان خوشکی ، یان کچی

(٣) کورد ، تورك ، وعرب ـ تالیف ـ سی جي ادموندز ـ ترجمة جرجیس فتح الله بغداد ـ مطبعة تایمس ١٩٧١ ص١٨

هەڵـکەو نییّت ، ناوبانـگی ژنێتی دەرکات ، لە دیوەخاندا ، شـان بـە شانی پیاوان دانیشێت ، لە سوارچاکیدا ملەملەیان لەگەڵ بکات ، چونـکە پـاوی بودەڵەو کەسێتی نزم ، یان بێ کەسێتی ، دڵی پیس بووە ، ماوەی ئافرەتی نەداوە ، لە کۆمەڵدا ڕەو بـکات و هەڵـکەوێت و سەرکەوێت بەڵـکو هەمیشە چەوساێنیوە ، خنیوێتی‌بە پێچـو ، پـەناوە ، لەبەر ئەوە لە جۆروباری ژیانی کوردەواری سروشتیدا ، ئازایەتی ئەمـە دەگەڕێتەوە بۆ پیاو ، ئـەو پیاوەی کـە نەریت و خـووڕەووشتی کۆمەڵایەتی پەروەردەی کردووە و ئاوی‌داوە ، کاتێك کە هیچ یاسایەکی دەستڕکرد یـان ئاسمانی دانەهاتووە و ئافرەت و مـافی ڕەوای بپـارێزێت •

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ، کە ئافرەتی بەکـەسێتی لە کومـەڵی کوردەواریدا ، ئەو ئافرەتەیە کە لە بەردەم میواندا ڕووی خۆشەو دەم بە پێکەنین ، و خزمە تکوزارە •

بەشـداری پـاو دەکات لـە خۆشی‌و ناخۆشیداو لـە کـار ئەنجامداندا • هەر وەکو ڕۆژ هەلات ناسەکان دەڵێن : پـاوی کورد دوژنەو سێژنەو چوارژنەیان نەهێناوە ، هێندە ئاغاو دەرەبەگ نەبێت • چەند ڕاستی‌یەك هەن پێویستە بەم سەبارەتەوە ڕوونیان بکەینەوە :

١ ــ ئەم نیشانانە لە مرۆڤدا ، هەموویان لەیەك ریزدانین ، بەڵـکو هەندێکیان وەکو : ئازایی ، بەخشندەیی ، نیشتمانپەروەری ، کوردایەتی، بەبەزەیی ، لێبوردن •• هتد •• ئەمانە لە پێشترن‌و پلەکانیان بالآترن •

ئەگەر چاوێك بگێڕین بە کۆمەڵی کوردەواریدا ، دەبینین نیشانەی میوان پەروەری‌و نانبدەیی ، دەست گیرۆدەیی ، بەو نیشانانە دەژمێررێن

کە مرۆڤ خۆشەویستو بەناوبانگ دەکەن ، هەروەها جەنگاوەریو کەڵە مێردی وەك تۆبەکەل ، دەنگ بە پیاو دەدەنەوەو ناوبانگی پێ پەیدا دەکەن ، بە ڕاستی ئازایی‌و کەڵەمێردی ، لە زۆر سیفەتی دیکەی مرۆڤ خۆش دەبن ، واتا ئەگەر مرۆڤێك چاو نەترس‌و ئازا بێت مەرج نی‌یە بەخشندە بێت ئەمەش لەبەر ئەوەیە باری تێستەی گەلەکەمان پێویستی بە ئازایەتی هەیە ، هەر وەکو چۆن ئەو کەسەی میوانپەروەرو بەخشندە بێت مەرج نی‌یە ئازاو چاونەترس بێت ، چونکە بەخشندەیی کەلێنێکی گەورەی باری ژیانمان پڕ دەکاتەوە بەڵام هەندێك لە نیشانەکانی کەسێتی هەرچەند بوونیان مەرجە لە مرۆڤی کەسێتی بەهێزدا ، وەکو زمان پاکی لە سەرخۆیی ، بە ئابڕوویی ، پلەکانیان نزمن بە گوێرەی ئەوان ، وادیارە لەبەر ئەوەیە کۆمەڵ ئەگەر پێی بکرێت سزای ناپاکی‌و داوێن‌پیسی دەدات ، بەڵام سزای کەسێك نادات کە بەخشندە نەبێت ، هەروەها پەلە کردن لەژیاندا ، زیان لەو کەسە دەدات کە هەڵەشەیەو بەس ، وەکو پەندە کوردی‌یەکە دەڵێت : شەیتان پەلەی کرد،چاوی خۆی کوێر کرد .

هەروەها ئەگەر بێینە سەر سیفەتی کوردپەروەری ، پێویستە ئازایی‌و دەست پاکی‌و نیشتمان پەروەری‌و دڵسوزی‌و خۆنەپەرستی‌و لەسەرخۆیی‌و تەبایی‌و گیانی یارمەتی‌و ئازادی‌خوازی‌و دادپەروەری لەگەڵدا هەبێت نابێت سیفەتی دۆفینێتی‌و ڕەگەزپەرستی‌و هوزەگەری‌و تیرەگەریشی لەگەڵدا بێت چونکە دژی یەکن‌و لە مرۆڤێکدا ، پێکەوە کۆنابنەوە ئەو کەسەی کە ئەم نیشانەی تێدا هەبێت ، پێویستە خۆهەڵکێش‌و سنگ‌هەڵکێش‌و بێار نەبێت دزوو درۆزن‌و ناپاك نەبێت ، ڕێزی هەموو کەس‌و (کەسی‌باش) هەموو نەتەوەیەکی لا هەبێت شاعری کورد فائق

بێ‌کەس[11] چەند شعیرێکی و تووە ، تا ڕادەیەك بۆ ئەم باسەمان دەس دەدات‌و دەڵێت :

**لە کوردا ئەو کەسەی بە وێژدانە کەوا مەردە**
**کە سەربەست بێ تا لەم ، ڕۆژا ئەویش بێ‌مسل هەم فەردە**
**ئەزیری ئەو لە دونیادا نیەو نابێ هەتا مەحشەر**
**دڵێ دەرحەق بەهاو چینی بلوری سافی بێ گەردە**
**بۆ ڕەحم‌و شەفقەتە دائیم لە بۆ شەخصێ کە بێ دەست بێ**
**ئەوی حەز بەو نەکا بێ‌شك لە لای خوا ڕو ڕەش‌و زەردە**
**تەبیعەت حاتەمی تائی ، لە فیکرا چەشنی لوقمانە**
**لە حیلم‌و حەوسەلەو ئیشدا دڵی ڕەق‌ڕەق وەکو بەردە**
**نیشانەی فەخرە بۆ ئێمە کە زاتێکی وەها مان بێ**
**ئیلاهی بەر قەراری کەی چراغی میللەتی کوردە**

۲ ـ زۆرترین کەس لە کۆمەڵدا لە هەموو سیفاتەکانیان ئاساین واتە دەکەوونە ناوەڕاستەوە ، بەڵام لە سیفەتێکدا یان زیاتر هەڵدەکەوون و وەدیاردەکەوون ، بەم جۆرە سیفاتانە دەووترێت (سمە) واتە نیشانە ، چونکە سەردەکەوێت‌و سیفاتەکانی دیکەی هەموو دادەپۆشێت‌و دەشارێتەوە ، بەڵام ئەو کەسانەی کە دەکەوونە ئەم پەڕو ئەوپەڕی سیفاتەکانیانەوە پێیان دەووترێت ناوێزە ، واتە پەرگرو لاگر ، مەرج نیە ئەو کەسانەی سیفاتەکانیان ئاسایی نەبێت تووشی نەخۆشی دەروونی بووبێتن •

★ ★ ★

---

(۱۱) ـ دیوانی بێ‌کەس ـ چاپخانەی (الادیب) بغدا ۱۹۸۰ ص۲۲۷ •

# جۆرەکانی کەسێتی

ئەگەر بوایەو بتوانرایە ، پێوانەیەکی ڕاستەقینەی وورد پێوی تەواو بۆ پێوانەی کەسێتی مرۆڤ دابهێنرایە ، کەسێتی هەموو مرۆڤی سەر ڕووی زەمینی پێ بپێورایە ئەو کاتە دەری دەخست کە جۆرەکانی کەسێتی مرۆڤ ئەوەندە زۆرن ، بە ئەندازەی ژمارەی دانیشتوانی ڕووی سەر زەمینن • بەڵام بەختی زاناو لێکۆڵەرەکان ئەوەندە گەورەیە ئەو تەقەلاو ماندووبوونە یان بۆ گەڕاوەتەوە ، چونکە تا ئێستە کەس لە زاناکان هەوڵیان نەداوە کە ئەو (کەسێتی پێوە) دروست کەن و دای هێنن • ئەمیش لە بەر ئەوە نەبووە کە کارێکی نەکردو ( محال یا مستحیل ) بێت ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە نیشانە بناغەیەکانی کەسێتی ئەوەندە لەیەکەوە نزیکن پێویست بە داهێنانی ئەو کەسێتی پێوە وورده ناکات •

چەند زانایەك(١٢) هەوڵیان داوە کە کەسێتی مرۆڤ و لاگرییەکانی بکەن بە چەند بەشێکەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دابەشکردنانە ڕەخنەیەکی زۆریان لێ گیراوە چونکە لەگەڵ ئەو هەوڵەدا سنوورێکی تەواوی لە نێوان ئەو بەشانەدا ، دانە ناوە ئەویش لەبەر ئەوە بووە ، دابەش کردنی کەسێتی بە شێوەیەکی زۆر وورد لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا

---

(١٢) الصحة النفسية والعلاج • د ـ حامد عبدالسلام زهران ط٢ ١٩٧٨ الناشر مكتبة عالم الكتب •

ناگونجێت ، ودەبێت ئەوە بزانین لەم دوایەدا ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیان ناو ناوە ( علم الانماط Typology )

**یەکەم : یەکەم کەس کە هەوڵی ئەم دابەش کردنەی داوە زانایەکی یۆنانی کۆن بووە ، بە ناوی هیپۆکرات(١٣) ، ئەم زانایە مرۆڤی کردووە بە چوار جۆرەوە ، هەر جۆرەو نیشانەو سیفاتی تایبەتی بۆ داناوون :**

**١ ـ کەسی میزاج خوێناوی(١٤) :**

ئەم جۆرە کەسانە شێوەی لەشیان گرتك لە گۆشتە ، تووڕەو حوڵحوڵین ، زوو زوو هەڵدەچن ، ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی دیکەوە ، خۆش بڕواو گەش بین و ڕووخۆشن ، چالاك و گورج و گۆڵن ، وورەبەرزو بۆ کار کردن زۆر بە پەرۆشن ، بە ئامانیش بە دەم دەستەوە دێن •

**٢ ـ کەسی میزاج زراوی :** یان زەرداوی (الصفراوی)

ئەم جۆرەیان توندو تیژو تووڕەو بەهێزن •

---

(١٣) هیپوکرات (٤٦٠ ـ ؟ ) پ.ز ، لە دورگەی (کوس) لە یۆنان زەمین ژیاوە یەکێك بووە لەنوشدارە کۆنە بەناوبانگەکانی جیهان ، لە (لارسا) کۆچی دوایی کردووە • ئەگێڕنەوە دەڵێن : جارێکیان یەکێك لە پادشاکانی ئێران زەمین دیاری یەکی زۆری بۆناردووە ، بۆ ئەوەی دڵی نەرم کات و هەڵی فریوێنێت ، بۆ ئەوەی بیبات بۆ ئەوێ ، چارەی ئەو نەخۆشییانەی پێ بکات ، کە ئەو سەردەمە بڵاوبووبوونەوە ، بەڵام زوو دەرکی بەمە کردوو ، دیارییەکانی بۆ ناردەوەو نەچوو ، چونکە بە ناحەزی وڵاتەکەی دەزانین

(١٤) میزاژ : بریتییە لە ( تەبیعەت ـ سروشتی )ی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی بەتایبەتی لەبارەی سۆزی و ئارەزو هەوەسی توخمییەوە لە کۆندا میزاجیان کردووە بە چوار بەشەوە •

**٣ ـ کەسی میزاج ڕەشایی :**

ئەم جۆرەیان ، هـەڵچوون بەهێزن ، دڵتەنـگ‌و وورەنزمن ، مڕومۆچ‌و خەماوین •

**٤ ـ کەسی فلیگماتی :**

ئەم جۆرەیان خاوو خلیچکن‌و هەڵچوون قوڕاوین ، ساردو سڕن ، دەبەنگ‌و سکەڕۆو زۆر خۆرن لەوە خۆشتر ئـەوەیە کـە ئەم زانایە مرۆڤی ڕەووشت‌ڕێکی بەو کەسە داناوە کە ڕەووشتەکانی لە هەر چوار جۆرەکە تێکەلاو بێت وەکو یەك بە بێ‌زیادو کەم ، وە ئەگـەر هـاتو یەکێکیان لەوانی دیـکە زیاتر بێت لە یەك کاتدا ، ئەوە ئەو ساکـە ئـەو مرۆڤە بە مرۆڤێکی دەروون نەخۆش دادەنرێت • ئەم دابەش کردنەش هەرچـەند ( دەروون زانی ) نویێ دانی پێـدا نانێت ، بەتایبەتی جۆری ڕەشایی‌یەکان ، بەڵام بە دابەش کردنێکی بە کەڵکی دادەنێت •

لە لایەکی دیکەشەوە ئـەم دابەش‌کردنەو دابەش کردنەکەی کەسێتی بە لای زانای ڕووسی باڤلۆڤەوە ، کە لەم سەدەیەدا کردوویەتی زۆر لـە یەکدەچن •

ئێمـە دەزانین باڤلوف‌و ئەو زانایانەی کـە تاقی‌کردنەوەیان لـە سەر ئاژەڵ کردووە لەو تاقی‌کردنەوانە کەڵك‌و بەرژەوەندی مرۆڤیـان مەبەست بووە •

ئەمجا لـە کاتێکدا کـە باڤلوف تاقی‌کردنەوەی لـە سەر سەگ دەکرد لـە سەرەتاوە ، وای زانی کە سەگ دوو تەرزی هەیە ، یەکەمیان زوو وەڵامی مەرجە تێکەرەکان دەداتەوە واتا کاتێك کە گوێی‌لەو زەنگە بوایە ، یان چاوی بە ڕووناکی ئەو گڵۆپە سوورە بکەوتایە کـە لـە کاتی

خواردندا بۆیان هەلدەگیرساند دەست بەجێ لیك بەدەمیدا دەهاتە خوارەوە ، باخواردینشی لەگەڵ نەبوایە ، بەلام تەرزی دووەم دەرەنگتر وەلامی مەرجە تینکەرەکان دەداتەوە ، کە گوێی لە دەنگی زەنگۆلە کە دەبوو ، یان چاوی بە تیشکی چرا سوورەکە دەکەوت ، بە دەرەنگ لیك بەدەمیا دەهاتە خوارەوە •

ئەمجا تەرزی یەکەی ناو نا ( تەرزی هەڵچوو - ( Exitatory

وەتەرزی دووەمیانی ناو نا تەرزی ( درژ - ( inbitory

بافلۆف دووای چەند تاقیکردنەوەیەکی دیکە تەرزێکی دیکەی بۆ دەرکەوت کە زۆر زووترو چالاکانەتر ، وەلامی تینکەرە مەرجیەکانی دەدایەوە •

ئەم جۆرە یانی کردە دوو بەشەوە تەرزی پرتەوی چالاکو تەرزی شینەیی نەچوڵ •

بافلوف باوەڕی وابوو کە هۆی ئەم جیاوازیانە ، دەگەڕێتەوە بۆ باری ( بۆماوە ) و بۆ پێکهاتنی مێشكو کۆئەندامەکانی دەمار •

**دووەم : کەسێکی دیکە لەو ، زانایانەی هەولی دابەش کردنی کەسێتیان داوە ، زانایەکی ئەلمانی بووە ناوی (کریشمار)ە(١٦)**

---

(١٥) علم النفس اسسه وتطبيقاته التربوية والاجتماعية ـ تاليف الدكتور عبد علي الجسماني طبعة متنقحة بسنة ١٩٨٤ بمطبعة الخلود في بغداد ص٢٢٦

(١٦) ئارنیست کریشمار ( ١٨٨٨ ـ ١٩٦٤ ) جولەکەیەکی ئەلمانییە بە دامەزرێنەری دەروونزانی ( الجبلي ) نوێدا دەنرێت ، کە لە کاتێکدا لە ئەلمانیا هەلهاتووە )پەنای بردووە بەر ئەمریکا ، لەوێ مایەوە خۆی بە چارەسەرکردنی نەخۆشە شێتەکانەوە خەریك کرد •

ئەم(١٧) زانایە کەسێتی مرۆڤی بە پێی شێوەی لەشولار ، یان با بلێین : بە گوێرەی بنیاتی جەستەو پەلوپۆی ، کردووە بە چوار بەشەوە ، یان بە چوار کۆمەڵەوە :

**کومەڵەی یەکەم :**

مرۆڤە گرتك لـە گوشتەکان

ئەم کۆمەڵەیە ، مرۆڤەکانی کورتە باڵاو بانۆڵەو خڕو مل کورتو شان خڕن ، تا ڕادەیەك باسك کۆڵو دەستو قاچ بچوکن •

ئەم جـــۆرە کەسانە دەم دەمین ، دەمێك ڕوخۆشنو دەمێك ڕوو گرژن ، یان با بلێین :

دەمێك دڵشادن ، دەمێك دڵ تەنگن ، لەگەڵ ئەوشدا زۆر بلێیو بزێوون ، گاڵتە چیو نەوسنو چلێسن ، لە لایەکی دیکەوە ئیش کـەرو گورجو گۆلن •

ڕێژەی زۆری ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی ( شادو دڵەنگی ) دەبن لەم جۆرە کەسانەن •

**کومەڵەی دووەم :**

کۆمەڵی لەش وەرزشی یەکان :

ئەم کۆمەڵەیە مرۆڤەکانی شان تێك سمراوو دەستو قاچ گـەورەن ئەندامەکانی لەشیان گونجاوو جون یەکن •

---

(١٧) علم النفس وتطبيقاته التربوية والاجتماعية ـ د ـ عبد علي الجسماني طبعة منقحة ١٩٨٤ طبع بمطبعة الخلود في بغداد ص٢٢٣ •

**کۆمەڵەی سێیەم :**

کۆمەڵەی لاوازەکان .

مرۆڤەکانی ئەم کۆمەڵەیە ، قەد باریك و لەش بووچەڵن ، قەبارەی لەشیان بە گوێرەی بەرزیی بالایان نیە ، سنگ تەسك و شان داتەکاو و دەست و قاچ درێژن .

**کۆمەڵەی چوارەم :**

کۆمەڵەی لەش گەجەرەکان .

مرۆڤەکانی ئەم کۆمەڵەیە ، لەشیان نالەبارو ناوێزەو نەگونجاو هەڵکەوتووە . رژێنەکانی لەشیان بە رێکی نارژێنە ناو لەشەوە ئەمجا کریشمەر رای وایە کە پەیوەندی لە نێوان کەسێتی مرۆڤ و جۆری هەڵکەوتنی لەش و لاریدا هەیە بە مەشەوە نەوەستاوە و زیاتر رۆیشتووە، جارێکی تریش هاتووە کەسێتی مرۆڤی بە پێی میزاژ دابەش کردووە و کردویەتی بە دوو بەشی سەرەکی یەوە .

## بەشی یەکەمیان

کۆمەڵەی میزاژ دەمەدەمین .

ئەم کۆمەڵەشی کردووە بە سێ کۆمەڵەی بچوکترەوە .

١ ــ جۆرە مرۆڤێکی دڵ پاك و خێرو بێر کەرو رووخۆش و کۆمەلایەتین .

٢ ــ جۆرە مرۆڤێکی (حولحولین) میزاژیان هەردەمی بە جۆرێك دەگۆرێت دەمێك تورەن و دەمێك رووخۆشن ، هەردەمی لە سەر بەزمێکن و هەردەمی لە سەر پەتێك یاری دەکەن .

٣ـ جۆرە کەسێکن کە دەمێك زۆر دڵشادن ، دەمێك زۆر دڵتەنگن ، واتە ئەم بەرِوو ئەوبەرِی سیفەتەکە دەگرنەوە ئەم زانایە دەڵێت لە ٩٥٪ی ئەو کەسانەی کورتو قەڵەوو پانۆڵەن ، بە شێوەیەکی گشتی میزازیان دەمەدەمیەیە •

دووای ئەوە هاتووە سێ پلەی داناوە لە نێوان زۆر دڵشادیو زۆر دڵتەنـــگیدا •

١ـ٣ـ جۆرە کەسێکن زۆر دڵشادو رِووخۆشو بزێوون •
٢ـ٣ـجۆرە کەسێکی مامناوەندین ، زۆر رِاستو پێش کەرن •
٣ـ٣ـ جۆرە کەسێکن زۆر دڵتەنگو خەمۆکین •

## بەشی دووەمیان :

مرۆڤە خـاوەن شیزیە کەسێتیەکان جۆرە کەسێکن ، بەسرکو شەرمنو لابەرِوو دوورەپەرێزن ، لە شوێنو کاتی خۆیدا بەـــەڵاچنو توورە نابن •

ئەمانە زۆر نیزیکن لەوەوە کە تووشی نەخۆشی شیزوفرینیا بن*

ئەم زانایە دەڵێت : لە ٧٠٪ی مرۆڤی باڵا بەرزی رەقەکاری لـەش پووچەڵ ، ناودەبرێن بە شیزەکەسێتی ، واتا : نیزیکن کە تووشی نەخۆشی شیزۆفرینیا بن •

هەروەهـــا هاتووە کـەسێتی میزاژ شیزی کردووە بە سێ پلەوە ( جۆر )ەوە :

١ ـ جۆرە کەسێکن زۆر هەستیارن •
٢ ـ جۆرە کەسێکن زۆر ساردو سرِن •
٣ ـ جۆرە کەسێکن زۆر ووشكو کەم هەستن •

# ڕەخنە گرتن لە دابەشکردنەکەی کریتیشمار

چەند زانایەکی دەروونی ڕەخنەیان لە دابەشکردنەکەی ئارنست کریتشمار گرتووەو وتویانە : تا ئێستە چەندەها لێکۆڵینەوە بۆ دەرخستنی ڕاستو درۆی ئەم دابەشکردنە ، کراوە ، هیچیان نەیان توانیوە بە تەواوی ڕاستی‌یەکەی بسەلمێنن .

بێجگە لەوەش ئەو پەیوەندی‌یەی ئەم دەیڵێت : لە نێوان کەسێتی مرۆڤو جۆری ڕسکاندنی لەشدا هەیە ، بە سەر هەموو کەسێکدا جێبەجێ نابێت ، یان با بڵێین هەموو کەسێك ناگرێتەوە . لەگەڵ ئەوەشدا شێوەی لەشو لاری مرۆڤ لەو تەمەنە درێژەی کە بەسەری دەبات ، لە سەر بارێك نامێنێتەوە ، بەڵکو دەگۆڕێت چونکە چەندێك ئەو مرۆڤە بچێتە ناو ساڵەوەو تەمەنی گەورە تربێت ، ئەوەندەش داروباری لەشی دەگۆڕێتو تێك دەچێت ، بێجگە لەوەش هیچ پێوانەیەك نی‌یە شێوەی لەشێك لە لەشێکی دیکەوە بە ووردی جیا بکاتەوەو بیپێوێت .

لێرەدا وا چاکە ئەوە بزانین کە کریشمەرو هاوڕێکانی هەوڵێکی زۆریان داوە کە پێوانەیەك بدۆزنەوە ، بتوانن داروباری لەشی مرۆڤی پێ بپێوون ، لە دوایدا ئەم هاوکێشەیان بۆ دیاری کردنی ئەو پەیوەندی‌یانەی کە لە نێوان شێوەی لەشی مرۆڤو جۆری کەسێتیدا هەیە ، داناوە .

درێژی لاق × ۳۱۰

———————— × ۱۰۰

چێوەی پانی سنگ × چێوەی درێژی سنك × بەرزی لەش(*)

تێبینی : ئەگەر ئەو کەسە لاواز بێت ، یان پانۆڵە بێت ، نرخی ئەنجامی هاوکێشەکە بەرز دەبێتەوە ، یان نزم دەبێتەوە بەرەوەدوال ( علی التوالی ) •

سێیەم :

کە کاتێك دەروون زانی نوێ هاتە کایەوە زانایەکی دیکە بە ناوی• ( یۆنگ(۱۸) Jung مرۆڤی کردە دوو تەرزەوە (جۆر) •

۱ ـ تەرزی : ( گۆشەگر ـ (Introrert

۲ ـ تەرزی : ( کراوە ، یان پەیوەندی گر Extravert )

تەرزی گۆشە گر :

ئەو کەسەیە کە حەز بە تێکلاوی‌و ناساوی‌و هەڵسوکەوتی ناو کۆمەڵ ناکات ، حەز بە نووکەو پێکەنینی زۆر ناکات ، چونکە شەرمن‌و دوورەپەروو کەمدووە ، خەیاڵاوی‌یە ، کاتێك توورە دەبێت ، نازانێت قسە بکات ، هەندێك جار کردەوەی سەیرو ناشیرین دەکات‌و ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ کەسێکدا ببڕێت ئەوەزۆر بە درەنگ لەگەڵیدا ئاشت دەبێتەوەو ئەگەر گەلاڵە کراوێکی کومەڵایەتی پێ بسپێرێت ، ئەوە بەدەگمەن تێداسەرکەوتوو دەبێت •

(*) لەش ـ الجذع مەبەست بە درێژی لە پێنجگەڵە سەرو دەستو قاچ دەتوانین بڵێین : قەد

(۱۸) کاول یۆنگ : لە پێشەوە بە کورتی باسی ژیانەکەیمان کرد

ئەم جۆرە کەسانە زۆر بەکەمی ئافرەت خۆشیانی دەوێت ، ئافرەتێك نەبێت وەکو خۆیان گۆشە گربێت .

لە لایەکی دیکەوە ئەم جۆرە کەسانە زۆر بەباشی کاروباری خۆیان دەبەنە ڕێوەو زۆر ووردوو بەڕاوو تەگیرن .

نیشانە لەشی‌یەکانی مرۆڤی گۆشەگر ، ئەوەیە لەڕوولاوازن‌و جەندیش خواردن بخۆن پی‌ی قەڵەونابن .

**تەرزی کراوە :**

ئەم تەرزە مرۆڤە ئەو کەسەیە کە لە زیانی تەنهای‌و گوشەگری ڕادەکات‌و هەڵدێت،لەبەر ئەوەی حەز بە تێکلای‌و ناسیاوی‌و هاوریکرتن‌و ڕووخۆشی‌و دەم بە پێکەنین دەکات ، گولی ناومەجلیس‌و کۆڕە ، هاودەم‌و هاوڕی‌یەکی کەم گلەیی‌یە ، جونکە مرۆڤێکی کراوەو بێ‌شەرمە نیشانە لەشی‌یەکانی ئەم جۆرە کەسانە قەڵەوو وورگنن . بەلام لەبارەی زەین ڕۆشنی‌و زەین‌کوێری‌یەوە هەردوو تەرزەکە هیچ جیاوازی‌یەکیان نی‌یە .

**یونگ :**

لە دوایدا هەریەکە لەم دوو تەرزە مرۆڤەی[19] کردووە بە (٤) جوار جۆرەوە :

١-١- جۆری گۆشەگری بیرەکەری : وەکو ئەو زاناو فەلسەفە زانانەی کە بە پێی تاقی کردنەوە لە ماناو واتەی ڕووت زیاتر بیر دەکەنەوە

(١٩) المدخل الى علم النفس الحديث ـ تاليف ، ريكس نايت ، ومركريت نايت . تعريب/ د ـ عبد علي الجسماني /ط٣ ١٩٨٤ ص٢٨٣ .

٢ـ١ـ جۆری گۆشەگری سۆزەگەری : بریتی یە لەو مرۆڤانەی کە زۆر هەستیان و سۆزیان بەهێزە ، بەڵام دەیشارنەوەو نایدرکێنن و دەری نابرن •

٣ـ١ـ جۆری گۆشە گری هەستەگەری : ئەو جۆرە کەسانەن کە کاتێك یانەوێت شارەزایی یەکی هەستیاری لەشت وەرگرن مەبەستیان تەنها باری جوانی ئەو شتەیە •

٤ـ١ـ جۆری گۆشەگری سروشتەگەری ( ساکار ) جـۆرە کەسێکن کـە کاتێك کـارێك دەگرنە دەس ، دەیانەوێت زوو بگەنە کورتەو ئەنجامی ئەو کارە ، بەڵام بە کردەوە ناتوانن جێبەجێی بکەن •

ئەمجا دێینە سەر چوار بەشەکەی تریان :

١ـ٢ـ جۆری کراوەی بیرەگەری : وەکو ئـەو زانایانەی بە بێ تاقی کردنەوە لە ڕاستی بابەتێ بیردەکەنەوە ودەکۆڵنەوە •

٢ـ٢ـ جۆری کراوەی سۆزەگەری : وەکو ئەو کەسانەی کـە بە ئاسانی بە گەرمی دەڕۆن بە دەم خەلکەوەو بەپەرۆشی تێکلاوی یان لەگەڵ دەکـەن •

٣ـ٢ـ جۆری کراوەی هەستەگەری لـە تاقی کردنەوەی ڕاستەوخۆ زۆر لەزەت ئەبینێ ، وهەموو کاتێك ، بۆ ئەوەی شارەزایی لە شت وەرگرێت ، حـەز لـە پەیوەندی ڕاستەو خۆ دەکات لەگـەڵ ئـەو شتانەی لە دەوروبەریدا هەن ، زوو بێزاریش دەبێت لەو پەیوەندی یانە ئەگەر پێکەرێك زووزوو وورپای نەکاتەوە •

٤ـ٢ـ جۆری کراوەی سروشتەگەری : جۆرە کەسێکن ئاسایی و ساکارن ، دەست پێشکەری دەکەن لەکاروباردا ، زۆر جـاریش تێـدا

سەردەکەوون ، بەڵام بەردەوام نین لە سەر ئەم دەستپێشکەری یانە .

**چوارەم :**

چوارەم دابەش کردن دابەش کردنەکەی ( سپرانجەرە Spranger) ئەم زانایە بە پێی (زاڵی) مرۆڤی دابەش کردووە ، بۆ تەرزی تیۆری تەرزی ئابوری ، تەرزی جوان پەروەری ، تەرزی کۆمەڵایەتی ، تەرزی ڕامیـــــاری .

**پێنجەم :**

بێجگە لەم دابەش کردنانەی کـە باسمان کردن ، چەند دابـەش کردنێکی دیکەش هەن ، گرنگترینیان ئەو دابەش کردنەیە کە زاناکانی دەروونزانی نەخۆشان کردویانە .

ئەم دابەش کردنە گرنگی یەکی زۆری هەیەو کەڵکی زۆری بۆ خوێنەری بەڕێز هەیە هەرچەند ئەم دابەش کردنەش و دابەش کردنەکانی دیکەش ، تێکڕا ڕەخنەیان لێ گیراوە ، وەکو : دوای چـەند لاپەڕەیەك باسیان دەکـــەین .

## ١ ــ کەسێتی ئاسایی (سروشتی) :

مەبەست لە کەسێتی سروشتی کەسێتی یەکی ئاسایی و مامناوەندی یە لـە ڕاستیدا دەروون زانەکان تا ئێستە نەیان توانیوە ، ئـەم کـەسێتی یە دەست نیشان بکەن لەبەر ئەوەی تا ئێستە ، لە سـەر واتایەکی تەواو بۆ ئەم وشـەیە ڕێنەکەوتوون یان نەیان توانیوە بیدۆزنەوە ، ئەمجا هـەر لەبەر ئەوە ، بە چەند پێناسەیەك ئەم کەسێتی یەیان پێناسە کردووە ، ئێمە لێرەدا تەنها سێ پێناسەیان ، بۆ خوێنەری بەڕێز باس دەکەین :

١-١- کەمێتی سروشتی ئەو کەسەیە ، کە تواناو لێهاتێکی کەمێتی باشی تێدا هەیە ، دەیش توانێت کە چۆن ئاڕاستە یان بکات ، ڕووەو ئەو ئامانجەی کە دەیەوێت یان هێنێتە دی ، دەیانڕەوێنێت •

زانایان ئەم پێناسەیە ، بە پێناسەیەکی (سارد) دادەنێن ، دەڵێن : زۆر کەمێتی پەشێویش هەن ، توانای تەواویان هەیەو دەتوانن بکەنە ئامانج یا ئامانجەکانیشیان جەوت‌وچێڵش‌بێت ، لەبەر ئەوە ئەم پێناسەیە بە پێناسەیەکی تەواودا نانێن •

٢-١- دووەم پێناسە دەڵێت : مرۆڤی سروشتی ئەو کەسەیە کە هیچ جۆرە نەخۆشی‌یەکی لەشی و دەروونی تێدا نەبێت •

دووبارە ڕەخنەش لەم پێناسەیەش گیراوەو ووتراوە : ئەم پێناسەیەو پێناسەی مرۆڤی دەروون دروست ، یەك دەگرنەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت وابێت ، چونکە مرۆڤی دەروون دروست مەرجە نەخۆشی دەروونی تیادا نەبێت بەڵام سروشتی مەرج نی‌یە هیچ جۆرە نەخۆشی‌یەکی تێدا نەبێت ، بەشکو جاری وا هەیە نەخۆشیشەو بەڵام بەرگری دەکات‌و نایەڵێت سەرکەوێت بە سەریدا و دەستەڵاتی بە سەردا درێژ بکات •

٣-١- سێیەم پێناسە دەڵێت مرۆڤی سروشتی ئەو کەسەیە کە خاوەن ژیری‌یەکی لەبارەو بەختیارو چالاکە ، لەگەڵ ئەمانەشدا دەتوانێت ، تواناو بەهرەکانی خۆی بەکار بهێنێت ، بۆ ڕزگاربوون لەو بەربەرەکانیانەی ، کە تووشی دەبن ، هەروەها دەتوانێت لەنگەری گونجاندنی خۆی لەگەڵ دەوروبەردا ڕابگرێت •

ئەم پێناسەیە پەسند کراوە ، لەبەر ئەوەی گرەوەو هەمە لایی‌یە

واتا : هەموو ئەو مرۆڤانە دەگرێتەوە ، کە بەختیارنو ئەوپەڕی هەوڵ دەدەن ، بۆ ئەوەی نەجەنگن ، یان سەرکەوون لەوبەر بەرەکانیانەی کە لەگەڵ ژینگەی خۆیانداو ناوەوەی خۆیاندا تووشیان دەبێت •

**ئەنجامی ئەم سێ پێناسەیە :**

دووای خوێندنەوەی ئەم سێ پێناسەیە دەتوانین بڵێین کەسێتی سروشتی بریتی‌یە لە کەسێتی‌یەکی پتەوو لە نیگەردار ، خاوەن ڕەووشتو سۆزو بیرکردنەوەیەك بێت کە بتوانێت لەگەڵ ژیانی ناوخۆیی‌و دەرەوەی لەشیدا ، بگونجێت ، بۆیە ئەمەش دەتوانێت چونکە سۆزو هەڵچوونێکی ماماوەندی هەیە ، توانایەکی خۆگری هەیەو باوەڕی بە خۆیی‌و بە کەسانی دیکەش هەیە •

## ٢ ـ کەسێتی گۆشەگر

ئەمە یەکێکە لەو دوو بەشەی کە هەردوو زانا ( یونگ ) و ( ڕوشاخ ) دایان ناوە ، یان با بڵێین : سەرێکە لەو دووسەرەی کە ( یونگ ) بۆ کەسێتی دایناوە ، واتا گۆشەگری‌و کراوەیی :

مانای وایە زۆرترین کەس لە کۆمەڵدا بە شێوەیەکی ماماوەندی لە هەردوو جۆرە سیفاتەکانیان تێدا هەیە ، بەشێکی زۆر کەم لە ئەندامانی کۆمەڵ زۆر بە لای گۆشە گریدا لایان داوە ، هەر وەکو چۆن بەشێکی زۆر کەم لەو ئەندامانەی بە لای کراوەیی‌و ڕوحەڵماڵراوی تەواودا لایان داوە ، چونکە ئەگەر بێت‌و ئەم دوو جۆرە کەسێتی‌یە ، زیاتر پەڕبگرن،واتا : زۆر گوشەگرین ، یان زۆر زۆر کراوە بن واتای وایە : ئەوە تووشی نەخۆشی دەروونی بوونو پێویستە چارەسەر بکرێن •

**نیشانەکانی کەسیتی گۆشەگر :**

١ ـ کەسیتی گۆشەگر زۆر بیر دەکاتەوەو دەکەویتە خەیاڵەوە •

٢ ـ تا پێی بکرێت خۆی دوور دەگرێتو تیکەڵاوی کەسانی دیکە ناکات ، کاتێك نەبێت پێویستی‌یەکی هەبێت چونکە تیکەڵاوی کردن بە لای ئەوەوە ئەگەرەو کۆسپە لەرێگەی ژیاندا ، ئەمجا لەبەر ئەوە هیچ گرنگی‌یەکی ئەوتۆ بە دراوو پارە نادات ، گوێ بە لایەنی ( مـادده ) ناداتو خۆی بەرز گرێت ، بەڵکو زیاتر گرنگی بە ڕەووشتی نموونەیی‌و بیرکردنەوەی ڕووت دەدات •

ئەمجا هەر لەبەر ئەمەیە هیچ جۆرە سەرکەوتنێکی ( مـاددی ) و کۆمەلایەتی بەدەست ناهێنێت •

٣ ـ کـەسیتی گۆشە گر زۆرهە ستیارەو زووش هـەڵدەچێت بۆ نموونە : زۆر زوو تورە دەبێت ، زۆر زویش دەتوانێت رقی خـۆی بخواتەوەو خەفەی‌بکات •

٤ ـ کەسیتی گۆشەگرو کەسیتی نەخوش بە نەخوشی شیزۆفرینیا زۆریان بەین نی‌یە هەر ئەوەندەیان بەینە نەخوشەکە گوشەگری‌یەکەی زیاترە ، و بەهێزترە • ئەمجا هەر لەبـەر ئەوەیە ووتراوە ( دەروون دروستی‌و دەروون نەخۆشی موویەکیان بەینە ) •

## ٣ ـ کەسیتی کراوە :

کەسیتی کراوە بەپێچەوانەی کەسیتی گۆشەگر ، ئەو کەسەیە کـە هەمیشە ڕووخوش‌و دڵخوشەو بە ڕاستی بیر دەکاتەوە ڕوو دەکـاتە کەسانی دیکەو لە کاتی لێقەومانو کارەساتدا وتووشبوونی گیروگرفتدا

به دەنگی کەسانی دیکەوە دەچێت ، وەکو فیشەکە شێتە هەر لەخۆیەوە هەڵناچێتو ئاڵۆز نابێت ، ئەگەر هەڵیش چوو زۆر زوو دادەمرێتەوەو هیچ لەدڵیدا نامێنێت

زانایان دەڵێن : مرۆڤی کراوەو ڕووخوش بەرهەمی کۆمەڵایەتیو ماددی زۆر بە دەست دەهێنێت .

ڕوشاخی[20] زانا دەڵێت : ( مرۆڤی کراوە زیرەکترە ) بەڵام وەکو لەپێشەوە لە باسی دابەش کردنەکەی ( یونگ ) دا باسمان کرد لەبارەی زیرەکییەوە هیچ جیاوازییان نییە بەڵام گوشەگرێکەی باری زیرەکییەکەی دەشارێتەوە .

## ٤ ـ شێزە کەسێتی

شێزەکەسێتیو کەسێتی گوشەگر زۆر لەیەکدەچن ، جیاوازییان تەنها لەوەدا هەیە کە شێزەکەسێتی ، چەند رواڵەتێکی دیکەی تێدا هەن ، کە لە کەسێتی گۆشەگردا ، نین ئەو ڕواڵەتانەش وەکو

مانگرتن ، گومانکردن ، زیاد لە پێویست نهێنیپۆشین ، هەڵچوونو سۆزەکەیان زۆر بەهێزە ، یان زۆر بێهێزە ، لە هەردوو کاتەکەدا ، یان لە هەردوو بارەکەدا بە پێی ئەو[21] بێدارکەرەوە نییە ، یان بە گوێرەی ئەو هەلوێستە نییە کە دەیان وورژێنێت ، مرۆڤی شێزەکەسێتی بێیارو هاوڕێیەباشترین هاوڕێیەرتووکو گۆڤارە .

---

(٢٠) علم النفس اسسه وتطبيقاته التربوية والاجتماعية ص٢٢٨
(٢١) فصام الشخصية ـ اعداد مكتبة الهلال في بيروت ـ عرض وتقديم الدكتور/مصطفى غالب ص٩١ .

ئەگەر منداڵ بێت کردەوەکانی زۆر سەیرە ، چارەسەری ئاسانترە بەڵام گەورە بێت چارەسەری زۆر گرانە .

دەبێت ئەوەش بزانین مرۆڤی شێزە کەسێتی زۆر نزیکە کە تووشی نەخۆشی ( شیزوفرینیا ) بێت‌و شێت بێت .

## ٥ ـ دڵتەنگە کەسێتی

ئەم جۆرە کەسێتی‌یانە وورەیان نزمە دوورە پەرێزن ژیانیان لا تاڵەو هیچ سووسەیەکی ڕووناکی لە گەلی ژیانیاندا ڕەچاو ناکەن دووا ڕۆژیان لا تاریکەو باوەڕیان بە خۆیان نی‌یە ، وا دەزانن بێ تواناو بێ دەستەلاتن‌و لێنەهاتوون ، هەست بە هیچ پێکەرو پاڵنەرێك ناکەن کەبیان بزوێنێت بۆ هەوڵدان ، لەگەڵ ئەوەشدا هەست بە لێپرسینەوەو ژانی ویژدان دەکەن ، هەندێك لەم نەخوشانە زۆر هەستیارن‌و هەڵچوونیان بەهێزە .

دوور نی‌یە ئەم جۆرە کەسێتی‌یانە توشی نەخوشی دڵتەنگی بن . هەروەها زۆر ترینی ئەو کەسانەی کە خۆیان دەکوژن لەم جۆرەن .

## ٦ ـ حۆلحولی‌یە کەسێتی

ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە کەسێتی‌یانەیان هەیە بێـارن و حولحولین ، چونکە لە سەر بارێکی سۆزی‌و مزاژی خۆیان ڕاناوەستن‌و خۆیان ڕاناگرن ، بۆیە ئەم بەڕو ئەوبەڕ دەکەن لە نێوان هێمنی‌و توڕەییدا لە نێوان ڕووخۆشی‌و ڕووگرژیدا . وەکو لە پێشەوە باسمان کرد ، کریتشمەر دەڵێت : پەیوەندی لە نێوان لەشی کەتەداو مزاژی بێبارددا هەیە ، هەر وەکو چۆن پەیوەندی لە نێوان شێزەکەسێتی‌و لە نێوان لەشی ڕەقەڵەو لاوازدا هەیە .

هەروەها دەرکەوتووە کە کەسێتی میزاج بێبار ، دوور نی یە کـە تووشی نەخۆشی دڵتەنگی بێت ٠

هەروەها ئەم جۆرە کەسانەش زۆریان خۆیان دەکوژن ٠

## ٧ ــ دڵەراوکێ کەسێتی

دڵەڕاوکێ کەسێتی ئەو کەسەیە کە دەکەوێتە دڵەڕاو کێوە ، لەبەر ئەوە هەمیشە دڵی تەنگ‌و داماوە لەشتێك دەترسێت کە خۆیشی نازانێت چی یە ٠ یان دەزانێت چی یە ، بەڵام زیاد لە پێویست دەترسێت ٠

لەڕاستیدا دڵەڕاوکێ ترسێکی پێویستە بۆ ژیانی مرۆڤ چونـــکە باڵی پێوە دەنێت بۆ گونجـــاندن‌و گوزەران کردن ، زۆر کـــارەساتی سروشتی هــەن ، مرۆڤ دەخەنە دڵەڕاوکێوە ، وەکو گەیشتنی منـداڵ بە تەمەنی هەرزەکاری ، یان گەیشتنی ئافرەت بە تەمەنی لەسك (زاوزێ) چوونەوە هتد ٠٠٠ بەڵام پێویستە لەسەریان دڵەڕاوکێ نەکەنە نان‌و ئاویان هەر دانیشتن‌و هەناسەی ساردی بۆ هەڵکێشن ، ئەگینا لەشیان دەهانجێت‌و جگەریشیان پارەپارە دەکات بەڵێ ڕاستە ئەو کۆمەڵەی کە ئێمــــە تێــدا دەژین پێویستی بە وە هــەیە کە تێدا سرك‌و ووریا بین ، جونکە پڕە لە بەربەرەکانی دەروونی‌و ڕامیاری‌و ئابوری وجەنگ‌و داماوی‌و لێقەوماوی بەڵام نابێت بە ترس‌و دڵەڕاوکی‌و ڕاڕایی خۆمان لەم جۆرە بەربەرەکانیانە ڕزگار کـەین ، بەڵـکو دەبێت هەوڵ دەین پەلامار دەین بچێنین‌و سەوز کەین‌و پەروەردەی ڕاست‌و بەرهەمدارکەین لەگەڵ ئەمانەشدا ، ئەوەش هەیە کە هەندێك دڵەڕاوکێ هەن ، چارەسەر کردنیان ئاسانترە ٠

**بۆ نموونـــە :**

ئەو کەسانەی کـە تووشی دڵەراوکی دەبن لە بەرێ ئیشی‌و بێ‌کاری

یان ئەو قوتابی‌یانەی کـــە تووشی دڵەراوکێ دەبن ، لەبەر ئەوەی لـــە قوتابخانە دەر ( فصل ) دەکرێن ، بەڵام دەبێت مرۆڤ وەکو : بەرد ووداو بێت لەم جۆرە کۆمەڵانەدا ، چونکە کۆمەڵێك کـە گیانی هەرەوەزیو هاوکاری تێدا کەم بێت ، واتای وایە لەوەڕێـکی مشەی تێـــدا دروست دەبێت ، بۆ ترس‌و دڵەراوکێ .

## نیشانەکانی دڵەراوکێ کەسێتی

١ ـ هەمیشە خۆی ئامادە کردووە ، و چاوەڕێی ڕووداوێك دەکات ، دەیەوێت ڕێگە بدۆزێتەوە کە چۆن خۆی رزگار بکات .

٢ ـ ناوێرێت جۆرە کـــارێك بگرێتە دەست ، لەبەر ئەوەی وا دەزانیت لە دوا ڕۆژدا تووشی لێپرسینەوەو تەنگ‌و چەڵەمەدەبێت .

٣ ـ لـــەبەر ئەوەی زۆر لە دوا ڕۆژ دەترسێت ، دەیەوێت زیانی باشە ڕۆژی خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی مسۆگەر بـکات .

٤ ـ بۆ ئەوەی ڕێـگەی هیچ تیرو توانجێك نەدات ، کە لە تواناو دەستەڵاتی بدرێت ، بۆ ئەوەی ڕێـگەی هیچ گومانێك نەدات لە ڕەووشتی بکرێت ، بەو پەڕی دڵسۆزی‌و ئەمێنیەوە ، پێویستی‌یەکانی ســـەر شـانی جێبەجێ دەکات کارەکانیشی بە تەواوی ئەنجام دەدات/ئەگەر بێت‌و بـە باشی لەم چوار نیشانەیە وورد بینەوە دەبینین : هیچ خرابی‌یەکیان تێـــدا نی‌یە ، ئەوە نەبێت ، کە کابرا بەهۆی دڵەراوکێوە ، یان با بڵێین ترسێکی نادیارەوە ئەنجامیان دەدات ، دڵەڕاوکێش بۆیە خراپە ، چونـــکە زیانی دروستی مرۆڤی هـــەیە ، بەڵێ ڕاستە هەڵچوونی دڵەڕاوکێ ، لـــە زۆر کەسدا ، بەدی دەکرێت‌و بوونیشی لە مرۆڤدا کارێـــکی پێویـــستە ، بۆ ئەوەی بتوانێت ، خـــۆی بگونجێنێت ، بەڵام ئەگەر هات و لـــە ڕادەی

ئاسایی خۆی دەرچوو ، ئەوە زیانی لە قازانجی زۆرترە ، چونکە لەوانەیە ئەو کەمە دڵەڕاوکێی‌دارە ، تووشی نەخۆشی دەروونی بکات .

چەند کردەوەیەك هەیە لە ترسی مرۆڤ کەم دەکەنەوە ، ئەو کردەوانەش وەکو ئەوەی کە ئەو مرۆڤە بچێت بۆ کەسێکی دیکە باسی دڵەڕاوکێکەی بکێڕێتەوە بۆ ئەوەی یارمەتی بدات‌و چارەسەری بۆ بکات ، یان دەبێت مرۆڤ لەو پلانەی کە دایناوەو دەیەوێت بیگەیەنێت بە ئامانجێکی بەرزتر ، یا چەند هەنگاوێك دابەزێت‌و بێتەخوارەوە ، یان ئەو نەخشەیەی کە کێشاویتی ، بۆ ئامانجەکانی ، نایگەیەنێت بە ئاوات ، دەتوانێت بیگۆڕێت بە نەخشەیەك ، یان بە چەند نەخشەیەکی دیکە .

## ٨ ـ کەسێتی زۆرەسەپێنراو

کەسێتی زۆرەسەپێنراو دەکرێت بە دوو بەشەوە ، کەسێتی بیرەسەپێنراو کەسێتی کردەسەپێنراو .

نیشانەی ئەم جۆرە کەسێتی‌یانە دوو پلەی هەیە ، پلەیەکیان لە پێشترەو پلەکەی دیکەیان لەدوواترە ، بە واتایەکی دیکە چەند نیشانەیەکیان زوتر دەردە کەوونو دیاری دەدەن ، چەند نیشانەیەکی دیکەشیان درەنگ‌تر دەردەکەوونو دیاری دەدەن .

### نیشانەکانی پلەی یەکەم

١ ـ بە پێی بەرنامەیەکی تایبەتی کارەکانی ناومالو دەرەوە ڕیك دەخسات .

٢ ـ زیاد لە پێویست گرنگی بە پاكو تەمیزی دەدات .

٣ ـ هەمیشە بە گومانە لە ڕادەی ڕاستی کردەوەکانی ، لەبەر ئەوە

پێیاندا دەچێتەوەو هەوڵی ئەوە دەدات کە باشترو تەواوتر ئەنجامیان بدات، لەگەڵ ئەوەشـدا بە هیچ جۆرێك ناگـــاتە بارێـکی کۆتاییو دڵی ئاو ناخوانەوەو گومانەکانی لا ناچێت •

٤ ـ ئەم جۆرە کەسێتییانە زۆر وورکاوی‌و مانگرن ، هەرگیز لەو ڕایانەی کـــە هـەیانە دانابەزن ، هەروەکو هێزێـکی نهێنی ئەمری بێ کردبێتن وایە ، یان هێزێکی ناوخۆیی لەشیان ئامۆژگاری کردبێتن وایە ، بۆیە لە کوردەواریدا وتوویانە : ئەم جۆرە کەسانە جنۆکەیان هـــەیە ، ئەگەر بێت‌و کارێك بەخەیاڵیاندا بێت ، کێچ‌دەکەوێتە کەوڵیان هـــەوڵ دەدەن ئەنجامی دەن ئەگینا واز ناهێنن •

## نیشانەکانی پلەی دووەم

١ ـ زۆر هەستیارن‌و دڵناسکن •

٢ ـ شـــەرمنن •

٣ ـ گۆشـــەگرن •

٤ ـ وورەیان نزمـــە •

٥ ـ کردەوەکانیان نموونەیییە ( ئایدیال )ە •

٦ ـ خۆشکێن‌و خونزمگرن ، واتا بێ فیزن •

٧ ـ بەرامبەر خۆشیان‌و خەڵـکی کەیش زیاد لە پێویست ڕەقن •

چـەند نموونەیەك :ـ

١ ـ ئافرەتێك هەبوو ڕۆژێکیان بەرێکەوت ، سەگێك چوبووە حەوشەکەیانەوە ، ئەبینم خەریکە حەوشەکەقوڕاو دەکات لێم‌پرسی ئەوە خوشکە چی دەکـەیت ؟

ووتی : گلاوی‌ی حەوشەکە دەردەکەم .
ووتم : ئەو قوڕاوە چی‌یە کردوتەتەوە ؟
ووتی : ئەی نازانیت گلاوی سەگ بە قوڕاو دەردەچێت ؟
ووتم : بـــا
ووتی : ئەی بۆچی ؟
ووتم : ئاخر حەوشەکەتان خۆی گلە .
ووتی : خۆ ( والله ) ڕاست دەکەیت .
دوایی ووتی : تۆ بڵێیت گلی گلێجانەکەی لای گەچۆڕەکە پاکتر نەبێت ؟

٢ ـ مام . ش ـ ع ـ ق ـ یك هـــەبوو ، پێش چـــەند ساڵێك لەمەوپێش کۆچی دوایی کرد .

ئەم کابرایە پیاوێکی زۆر موسڵمان بوو دەنگیشی زۆر خۆش بوو ، قورئانیشی ڕەوان بوو ، لەبەر ئەوە کەسانی دیـــکە زور ڕێزیان دەگرت ، بەتایبەتی هەندێك کردەوەشی ســەیر بوو ، دانیشتوان پێـان دەووت : کابرایەکی (عملی)یە ئەمجـا هەموو ساڵێك دووجار ، سێ‌جار دەهـاتە دیدەنی دێ‌ژاڵـــە ئــەم کابرایە خـــاوەن ( کەسێتی‌یەکی کردەسەپێنراو ) بوو ، یان با بڵێین :

(کەسێتی‌یەکی کردە سەپێنراوی)ی هەبوو ، چونکە کە دەستنوێژی دەشووت ، لە لێواری ئاوی چەمەکەوە ، دەستنوێژی هـەڵنەدەگرت ، بەڵـکو ، تا وەکو ناوقەدی خۆی هەڵدەکردو دەچووە ناوەڕاستی ئـــاوە خوڕەکەوە ، کەسێ ئاشگێر ئاوی پیادا دەڕۆیشت ، هەر بەوەش قـایل نە دەبوو ، بەشکو دووجار سێ‌جار دەرەچووە دەرەوەو دەگەڕایەوە نـاو ئاوەکە دەستنوێژی دەشوشتەوە ، بێجگە لەوەی لە قۆڵ شتن و قـــاچ

شتدا بەئانیشك‌و قولەقاپ‌و ، بە ئەندازەی (سوتنەت)ەوە ، نەددوەستا ، هەر یەکە چوار جارو پێنج‌جار دەی‌شوتەوە •

هێشتان ئەگەر بیتوانیایە لە ‌ژگەوتەکەشەوە دەگەڕایەوە کەرەتێکی دیکە دەست‌نوێژەکەی دەشوتەوە •

بە ڕاستی گۆڕینی ئەم جۆرە کەسێتی‌یانە ، بۆ کەسێتی‌یەکی ئاسایی زۆر زەحمەتە چونکە بۆماوە دەوری هەیە لە دروست‌بوونی ئەم جۆرە کەسێتیانەدا •

## ٩ ـ بارانۆدە کەسێتی

بارانۆ دە کەسێتی ، یان کەسێتی گومانبەر بە چەند نیشانەیەکی تایبەتی‌یەوە دەناسرێتەوە •

کردەوەو بیرو باوەڕی خۆی نەبێت ، هینی کەسی دیکە بە ڕاست نازانێت ، لەبەر ئەوە دەبینین بەرامبەر ڕاکانی ڕەقەو سوورە لە سەر ، سەرخستنی ڕاکانی خۆی‌و داتابەزێت ، لە لایەکی دیکەوە دڵی زۆر ناسکەو زۆر هەستیارە لەبەر ئەوە زوو زوو هەڵدەچێت‌و زیاتر گومان پەیدا دەکات ، بەرامبەر کەسانی دیکەو بیرو باوەڕیان ، ئەمانە هەموویان دەبنە هۆی ئەوەی کە یارو هاوڕێی کەم بێت‌و پەیوەندی بە کەسانی دیکەوە بێ‌هێز بێت •

ئەگەر ئەم نیشانانە زیاتر بە ڕیگرن‌و بەهێز تر بن دوور نی‌یە کابرای نیشانەدار تووشی نەخۆشی شێتی ( شیزۆفرینیا ) نەبێت •

## ١٠ ـ کەسێتی سایکۆباسی

دەتوانین بەم کەسێتی‌یە بڵێین : کەسێتی (سەرسەری) : ئەم جۆرە

کەسانە ناتوانن زاڵ بن بە سەر پێکەرە ڕەووشتی‌یەکانیاندا ، کە گوناه دەکەن‌و کردەوەی دژ بە کومەڵ دەکەن ، بە هیچ جۆرێك هەست بە پەشیمانی‌و زانی ویژدان ناکەن ، چونکە ویژدانیان ناجوڵێت •

بە ڕاستی کەسیتی سایکوباسی تا تەمەنی نەگاتە ( ١١ ـ ١٥ ) ساڵ دیاردەکانی دەرناکەوێت ، لە سەرەتایی تەمەنی هەراشیدا ئەم نیشانانەی لێ بە دەردەکەوێت :

## نیشانەکانی کەسێتی سایکوباسی

١ ـ زۆر توورە دەبێت‌و هەڵدەچێت •

٢ ـ دەست درێژی دەکات‌و وورژم دەباتە سەر کەسانی دیکە ، بەبێ هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەك •

٣ ـ بێ‌بەزەیی‌یانە ئازاری کەسانی دیکەو گیان‌لەبەران دەدات •

٤ ـ بەبێ هیچ هۆیەکی بەسندراو ، شت‌ومەك دەشکێنێت ، ئەوەی بکەوێتە بەر دەستی وێرانی دەکات‌و دەی‌ڕووخێنێت •

٥ ـ بە هەر ڕێگەیەك بێت ، چ راست چ چەوت ، بە زۆر ئارەزووەکانی خۆی تێر دەکات •

لە کۆتایی تەمەنی هەراشیشدا ئەم نیشانانەی لێ بە دەردەکەوێت •

١ ـ درۆی گەورە گەورە دەکات •

٢ ـ خۆی پێ ناگیرێت ، لەبەر ئەوە هەرچی چۆنێك بۆی بلوێت پاڵەری توخمی تێر دەکات •

٣ ـ لە مەی نۆشی ، جگەرەکێشان‌و قومارکردندا ، چاو

مرۆڤی گەورە دەکات •

٤ ـ هەمیشە دەسوڕێتەوەو شەڕ دەنێتەوەو ڕێگە بە کەسانی دیکە دەگرێت •

٥ ـ کە گەیشتە تەمەنی هەرزەکاری ئەم نیشانانە باشتر ئاشکرا دەبن‌و زیاتر بە دەردەکەوون ، بە تایبەتی ئەگەر لەشی بە خۆوە بێت چونکە قۆڵ‌و بازووی بەهێز دەبن‌و دەتوانێت بە ئاسانتر سەرکەوێت بە سەر کەسانی دیکەدا •

هۆی دروست بوونی کەسێتی سەرسەری ، هەندێك لە زاناکان دەڵێن :

بۆ ماوەیە بەڵگەشیان ئەوەیە کە هەر لە منداڵی‌یەوە دیاردەکانی وە دەردەکەوێت ، ئەوەشمان لە بیر نەچێت لە سەرەتای قۆناغی هەراشی‌یەوە بە باشی دەردەکەوون •

## ١١ ـ کەسێتی هیستیری

کەسێتی هیستیری ، کەسێتی‌یەکە کە ئەم نیشانانەی خوارەوەی بە باشی تێدا دەردەکەوێت

**یەکەم :**
گرنگی‌یەکی زۆر بە خۆی دەدات‌و خۆیشی زۆر خۆش دەوێت •

**دووەم :**
بە هەر جۆرێك‌و ڕێگەیەك بێت ، دەیەوێت خۆی دەرخات خۆی بنوێنێت ، سەرنجی کەسانی دیکە بۆ لای خۆی رابکێشێت •

**سێیەم(٢٢) :**

زۆر حەز بە چاولێکەری‌و لاسایی کردنەوە دەکات .

**چوارەم :**

توانایەکی زۆری تێدا هەیە ، بۆ درۆ کردن‌و فیشاڵ‌و دەوربینین و خۆگۆڕین .

**پێنجەم :**

لە لێپرسینەوەو بە دایەخ کەوتن ڕادەکات‌و خۆی دەشارێتەوە یان پشت بە کەسانی دیکە دەبەستێت ، لەم ڕووەوە .

**شەشەم :**

زوو زوو توڕە دەبێت‌و هەڵدەچێت ، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵچوون و سۆزەکانیشی کاڵ‌و نابەکام‌و منداڵانەن .

**حەوتەم :**

هەندێك لەم جۆرە کەسانە ، لە ژیانی هاوسەریاندا سەرناکەوون و دەخزێن ، چونکە ژیانی توخمیان کاڵ‌و تاڵە .

**هەشتەم :**

نیشانەکانی کەسێتی هیستیری ، لە ئافرەتدا ئاشکراترو دیارترن وەك لە پیاواندا .

## هۆی دروست بوونی کەسێتی هێستری

زاناکان دەڵێن : هۆی دروستبوونی ئەم کەسێتی‌یە بۆ ماوەیە ،

---

(٢٢) ـ فصام الشخصية ـ اعداد مكتبة الهلال في بيروت ـ عرض الدكتور مصطفى غالب ط٤ ١٩٨٢ ص٩٥ .

لەبەر ئەوەی کە ئەگەر بێت‌و بگەڕێین لە نێو خزم‌و کەس‌و کاری ، ئەم کەسێتی‌یانەدا دەبینین نیشانەکانی ئەم کەسێتی‌یە لە هەندێکیاندا بە دەردەکەوێت •

بەڵگەیەکی دیکەی ، ئەو زانایانە ئەوەیە ، کە دەڵێن : نیشانەکانی ئەم کەسێتی‌یە ، هەر لە تەمەنی هەرزەکاری‌یەوە بەدەردەکەوون ، بەڵکو جاری وا هەیە لە تەمەنی هەراشیدا ، بەدەردەکەوون ، واتای وایە گمشەکردنی داروباری لەش ، کارکەرێکی یارمەتی دەرە ، بۆ ئەم کەسێتی‌یە •

زۆر کەس لەم جۆرە کەسێتی‌یانە ، هەر لە خۆیانەوە چاك دەبنەوەو بەرەو کەسێتی‌یەکی لەنگەردار دەڕۆن ، ئەگینا لێیان دەکات بە نەخۆشی دەروونی ( هیستریا ) •

## ١٢ ــ کەسێتی نالەبار

کەسێتی نالەبار ، یان کەسێتی بێ‌لەنگەر ، بەرامبەر کەسێتی ڕێك‌و بەلەنگەر دادەنرێت ، چونکە ڕاست وایە ، کە کەسێتی لەنگەردار بیر کردنەوەی‌و ڕەووشت کردنی‌و سۆزی بگونجێن وەکو یەك ڕێك بن، هەروەها ئەو کەسە بگونجێت لەگەڵ ئەو دەوروبەرەی کە تیادا دەژی ، هەر وەکو : چۆن ژیانی ناو خۆیی لەشی بە شێوەیەکی ڕێك‌وڕێك دەڕوات ، گرنگترین نیشانەی کەسێتی‌یەکانی ئەم جۆرە مرۆڤانە ئەوەیە کە باوەڕیان بە خۆیان وبە کەسانی دیکەیش هەیە ، لە هەڵچوون‌و توڕەبوون‌و کردارکردندا تەرازوون ، بە پێچەوانەی کەسێتی نالەبار ، کە بیر پچراوو خەیاڵ‌پلاوو سۆز نەگەیو،هەڵچوون بەشێو دڵ پیسوو خانە گومانە ، کردەوە قەڵس‌و نارێك‌و بێ ئەنجامە، کەسێتی نالەبار ئەگەر

زیرەکیش بیت ، بە هیچ ناچێت ، چونکە دوای ئارەزووی چەوت و چێل دەکەوێت .

## ١٣ ـ کەسێتی بە ئاستەم بەند Vulnerable

بۆیە ناومان نا بەئاستەم بەند ، چونکە بە کەمترین هەوڵ ، یان بە کەمترین پەشێوی ، وورەیان نزم دەبێتەوەو دەروخێن .

ئەم جۆرە کەسێتی یە ، دەمێك ساغن ، و دەمێك نەخۆشن ، هەروەها لەم دوو ئاوانەدا دەژین ، یان با بڵێن : لەم دوو نێوانەدا دەژین، زۆزترین دەروون نەخۆشەکان ، لەم جۆرە کەسانەن،هۆی دروست بوونی ئەم جۆرە کەسێتی یەش ، ئەوەیە کە هەر لە منداڵی یەوە بەنازکراوون زیاد لە پێویست پارێزراوون ، ئەمجا کە گەورە بوون ، هەستوا دەکەن کە بە تەنها ناتوانن بە ڕەنگاری هیچ جۆرە کۆسپێکی ژیان بین ، ئەم هەست کردنە وای لێ کردوون لە مەیانگەیەکی تەسك و باریکدا بژین و نەش وێرن لەو چوارچێوەیە بچنە دەرەوە .

## ١٤ ـ کەسێتی میزاژ فلێگماتی

یان کەسێتی سارد ، ئەمە ئەو جۆرە کەسێتی یەیە کە هیپوکرات باسی کردووە ئەمە ساردو سرە ، و خاوو خلیچکە ، هەڵچوونی زۆر کەمەو سۆزی وەستاوە گیانی هاوکاری و یارمەتی بە هیچ جۆرێك تێدا نی یە ، نیشانەکانی ئەم جۆرە کەسێتی یانە هەر لە منداڵی یەوە بە دەردەکەوێت .

## ١٥ ـ نزمە کەسێتی

نزمەکەسێتی ، یان کەسێتی نزم ، ئەو کەسەیە کە هەمیشە لای

خوارەوە دەگرێت‌و لە پەرەوە دەژی ، بە دوای خەڵکەوەو ملکەچی خەڵکە ، پەنایان بۆ دەبات‌و گیانی بەوانە ، بۆ ئەوەی کە هەست بە هیچ شورەیی‌یەك بکات . ئەمەش لەبەر ئەوەیە وا هەست دەکات کە ناتوانێت بە تەنها ، یان لە ڕیزی کۆمەڵدا بژی‌و پشت بە خۆی ببەستێت .

## ١٦ ـ سۆزە کەسێتی

ئەو کەسەیە کە پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دیکە لە سەر بناغەیەکی بیرو ژیری نابەستێت ، بەڵکو لە سەر بناغەیەکی سۆزی‌و ئارەزو سەندی دەبەستێت ، هۆی ئەمەش ئەو پەروەردەکردنە منداڵی‌یەیە کە ئەو منداڵەی تێدا ژیاوە ، هەندێك لە زانایان دەڵێن سۆزی بەهێزو هەڵچوونی زۆر ، بۆتە چەند هۆیەکی با یلۆژی دەگەڕێتەوە ، بۆ نموونە دەڵێن : ( دەماخی ) هەندە کەسێك سۆزو هەڵچوون ، بەهێزتر دەردەبڕێت .

## ١٧ ـ کەسێتی دەمارگر

ئەو کەسێتی‌یەیە کە لە هەندە سەبارەتێکدا ، یان لە هەندە هەڵوێستێکدا هەر لە خۆیەوە هەڵدەچێت ( عصبی ) دەبێت ، هۆی دروست بوونی ئەم جۆرەیان یەکێکە ، یان زیاتر لەم هۆیانەی خوارەوە :

١ـ١٧ـ ماندوو بوونی زۆر .
٢ـ١٧ـ نەگەیشتن بە ئامانج .
٣ـ١٧ـ نەخۆشی .
٤ـ١٧ـ ژانە سەر .
٥ـ١٧ـ زیاد ڕژاندنی ( گلاندی سایرۆید ) .

## ١٨ ــ دژەکەسێتی Passeve - Person

دژە کەسێتی ئەو کەسەیە کە هەمیشە بە پێچەوانەی کەسانی دیکەوە ڕەفتار دەکات‌و بەشداری چالاکی‌یەکانیان ناکات بە تایبەتی ئەگەر لەگەڵ ئارەزووە کانی ئەودا ڕێنەکەوێت ، ئەم کەسێتی‌یە گیانی مانگرتن‌و بەرهەڵستی کردنی تێدا بەهێزە ، ئەویش لەبەر ئەو هۆیانەیە کە باسیان دەکەین :

١ــ١٨ــ لەبەر ئەوەیە کە حەز ناکات باری گران هەڵگرێت‌و تووشی لێ‌پرسینەوە بێت •

١٨ــ٢ یان زۆر بە خۆیدا دەنازێت‌و ، خۆی هەڵدەکێشێت‌و ، لەبەر ئەوە نایەوێت بەشداری هیچ چالاکی‌یەکی کەسانی دیکە بکات ، ئەگەر بێت‌و بەگوێرەی ئارەزووی ئەو نەبێت •

٣ــ١٨ــ جاری وا هەیە هۆی ئەم نەگونجاندنەو تەبایی نەکردنە ئەوەیە کە ئەو کەسە هەست بە کەمەری دەکات ، دەترسێت بخزێت ، بەڵام نایەوێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەری بڕێت ، بەشکو بەوە دەری دەبڕێت کە لانەرەسکە دەبەستێت‌و دوور دەکەوێتەوەو نایەوێت ڕێ‌بگرێت‌و بێتە ناو ڕیزەوە •

## ١٩ ــ داهێنەرە کەسێتی Creative - Personality

داهێنەرە کەسێتی ، یان بلیمەتە کەسێتی ، یان کەسێتی بلیمەت‌و دروستکەر بابەتێکە سەرنجی زانایانی ، بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە ، بە زۆری لێی دواون‌و باسیان کردووە ، لە سەر هۆکان‌و سەرچاوەکانی ناکۆکی کەوتوتە نێوانیانەوە •

لـه کۆندا باوەڕیان وابووە ، کـە بلیمەتی کارێـکی ناوێزەیەو لـە توانای مرۆڤدا نی‌یە ، بەڵـکو دەسکردی شـەیتانە ، یان دەسکردی جنۆکەیە ، یان خوای ( هەڵبەستە ) •

وەکو : (سوکرات) لە کاتێـکدا کـە دادگەر گوناهباری کرد بە دانانی هەڵبەستی خراپو خرابکردنی ڕەووشتی لاوان ، لە وەڵامـدا ووتی : ئێمەی زانا ، کاتێك کـە هەڵبەست دەڵێن : خۆمـان نازانین چ دەڵێین • هەرچەند خەڵـکی ئێستە بڕوایان بەمانە نی‌یە لەگەڵ ئەوەشدا ، زۆر کەس باوەڕیان وایە کـە مرۆڤی بلیمەت ، پێویستە(٢٣) جار بەجار تووشی بە شێوی‌یەکی دەروونی بێت ، لەبەر ئەوەیە ، وتوویانە (الجنون فنون) ، واتە شێتی جۆریکە لە هونەر ، یان شێتی لەهونەرە ، هـەر لە بەر ئەوەیە کـە باوەڕیان وابووە مرۆڤی بلیمەت ، چار بە جارتووشی جـۆرە نەخۆشی‌یەکی دەروونی دەبێت ، یان هـەر بە یەکجاری شێت دەبێت ، لەبەر ئەوە چـەند زانایەك کـە ڕاوونو هەوڵیان داوەو ژیانی زۆر کەس لـە بلیمەتەکانیان پشکنیوەو ئـەم دیوو ئەدیویان کردووە ، بۆ ئـەوەی کـە لەکەیەك ، جۆرەناوێزەیەك ، نالەباری‌یەك یـان نەخۆشی‌یەکی دەروونی لە ژیانی بلیمەتەکاندا بدۆزنەوە ، لە ڕاستیشدا بە نائومێدی ئە گەڕاونەتەوە ، بەڵکوو دەست کەوتی باشیشیان هەبووە •

**بۆ نموونـە(٢٤) :**

١ ــ بۆیان دەرکەوتووە کـە وێنەکێشی بەناوبانگ فـان گوگی هۆڵەندی ( ١٨٥٣ ــ ١٨٩٠ )ز تووشی نەخۆشی شێتی شیزۆفرینیا بووە ،

---

(٢٣) ــ المرض النفسي طريق الى السعادة ــ تاليف ـدـ لويس بش ــ ترجمه الى اللغة العربية عبدالمنعم الزيادى ط (١) ١٩٥٧ ص١٣

(٢٤) ــ مجلة العربي العدد ١٧٣ نيسان ١٩٧٣ ص ٤٦ ــ ٤٩ •

هەندێکیان دەڵێن : تووشی پەرکەم بووە ، دەڵێن : لەبەر ئەوەی هەندێك لە وێنەکانی دەخالاندو نوختەنوختـەی دەکردن ، هەندێـکی تریانی دەخەتاند واتا خـەتی زۆری لـە سـەریەکدا دەنا ، ئـەم خالاندن‌و خەتاندنەش بەڵـگەیە لە سەر ئەو جمـە ناتەواوە دەروونی‌یەی کـە لـە نەخۆشی‌ی ( پەرکەم ) دا هـەیە وە بەڵـگەیەکی تریشیان ئەوەیە ، ئەو خەونە بجربجڕانەو بێ سەروبەرانەی کە ئەو دەیدیتن •

هەروەها ئەو کاغەزە (نامە) سـەیرە فەلسـەفی‌یانەی کە لە دووادووای ژیانیدا بۆ هاوڕێـکانی دەینووسین •

٢ ـ نووسـەری ڕووسی بەناوبانگ ( فیـدور ـ دوستوفیـسکی ـ ١٨٢١ ـ ١٨٨١ )ز لەبەر ئەوەی قومارچی‌یەکی بەربادبووە ، ریسواو قەرزاربووە ، هەر لەو کاتەدا بووە ، بەرهەمە گـەورە بە نرخەکـەی بەناوی ( قومارچی ) نوسیـوە •

ئایا تۆبڵێت : بۆ ئەوە خۆی کردبێتە ، قومارچی ، بتوانێت باشترین بەرهـــەم بنوسێت ؟ زۆر کەس دەڵێن : تووشی نەخۆشی ( پەرکەم )یش بووە ، دەڵێن : ئەگینا چۆن توانیویتی لە چیرۆکەکەیدا کـە بەناوی ( گێژ Theldiol ) بە ووردی ئەو هەستانەی کە نەخۆشی‌ی (پەرکەم)دار دەیکات ، لە کاتی (فێ) لێ‌هاتندا ، بنوسێت‌و باسی بکات •

ئایا تۆ بڵێت : (پەرکەم) ژیانی لێ تاڵ کردبێت‌و شێوانیتی ؟

٣ ـ دەڵێن شـکسـپـیر کەسێتی‌یەکی وون‌و نادیاری هـــەبووە ، ئەمیش لەبەر ئەوە بووە ژیانێکی ئاسایی‌و هێمنی بە سەر بردووە ، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێتی‌یەکی پڕ بەرهەم‌و سەرنج ڕاکێشـەری هەبووە ، هـەتا هەتایە چرای بلیمەتی ئەو ناکوژێتەوەو گڕی ڕووناکی ئاگری ئـــەو

داناسرێتەوە ، نووسینەکانی شکسپیر هەموو پێچوپەنایەکی دەروونی مرۆڤی ڕوون کردۆتەوە ، خۆشەویستی ، کلۆلی ، کیەبەری ، وماتمی ، خۆکوشتن‌و بوولەکێتی ، ڕووی نهێنی لە سەر ئەمانە هەمویان ، هەڵمالیوە •

ئەگەر وا دانێین :ـ شکسپیر مرۆڤێکی دەروون ئالۆزی ئالۆسکاوی نەخۆش بووبێت ، ئایە خوێنەران بەرهەمەکانیان لەبەر چاودەکەوێت ؟ نە وەڵامدا دەڵێن : نەخێر ، چونکە خوێنەران کاڵك خۆرن‌و بێستان ڕن نین •

لە ڕاستیدا شاعری عەرەب ( ابو الطیب المتنبي ) ، نووسەری لوبنانی ( جوبران خەلیل جوبران ) یشیان لەم بوختانە دەرنەکردووە دەڵێن : ( المتبي ) ناز ناوەکەی بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە داوای پێغەمەرایەتی کردووە ، ( جوبرانیش ) لە نامە دڵدارەکانیدا بۆ ئافرەتێکی ئەمریکی ، وا دەردەکەوێت هەناوی پارەپارە بووە ، هەستی بە کەمسەری‌و بێ دەستەڵاتی کردووە ، لەبەر ئەوە ، کەمتییەکی پجر پجری هەبووە •

ئەمجا لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوەو دەڵێت : ئایە مەرجە هەموو هونەرو داهێنراوێك ، لە هونەرمەندو داهێنەرێکی زیان ئاسایی‌و ڕەووشت رێکەوە ، وخوو سروشتییەوە بێتە دەرەوە ؟ لێرەدا ( دوکتور فەخری[25] دەباغ ) وەلامان دەداتەوەو دەڵێت خۆینەری بەوبژدان‌و ڕاست ، هەرگیز بۆ دیوی تایبەتی ژیانی هونەرمەندو داهێنەر ، ناگەرێت‌و ناپشکنێت ، دەڵێت : ئەمیش لەبەر ئەوەی ، ئەو هونەرمەندەی ، یان ئەو داهێنەرەی کە پەڵەیەك یان لکەیەك ، بە سەر پەردەی ژیانییەوە

---

(٢٥) مجلة العربي ـ العدد ١٧٣ نيسان ١٩٧٣ ص٤٩

بێت ، لەپێش چاوی خوێنەری نەخات‌و بەرهەمەکەشی لێڵ‌و قوڕاوی نەکات ، دەبێت ئەوەش بزانین هەموو بەرهەمێکیش نابێزرێت‌و لێڵ نابێت ، با بەرهەمەکەش ، بەرهەمێ هونەرمەندێکی لکەدار بێت .

لێرەدا پرسیارێکی دیکە خۆی دەردەخات‌و دەڵێت کام هونەرمەندە کە پێویستە بەڕەی ژیانی ساف‌و بێ گەرد بێت ؟

لە وەڵامدا دەڵێن : هونەری قوماربازی ، یان قومارچێتی مەرج نی‌یە هونەرمەندەکەی قومارباز بێت ، یان قومارچی بێت ، بەڵام هونەری ئاینی‌و هونەری کۆمەلایەتی ، مەرجە هونەرمەندەکانیان خۆیان ڕەووشتیان جوان‌و بێ‌گەرد بێت . ئەگەر بێت‌و یەکێك لێمان بپرسێت‌و بڵێت : ئایە تۆ بڵێت مرۆڤی داهێنەرو بلیمەت نەتوانێت بەرهەم داهێنێت ، کاتێك نەبێت کە تووشی بە شێوی‌یەکی دەروونی بێت .

لە ڕاستیدا هەرچەند(٢٦) لێکولینەوە ، لەم بارەیەوە ، تا ئێستە هەر بەردەوامەو ڕۆژ ڕۆژ پێشدەکەوێت پەرە دەسێنێت ، لە وەڵامدا دەڵێن : نەخێر وا نی‌یە چونکە ئەو لێکۆلینەوانەی کە لەسەر ژیانی داهێنەرەکان ، دوای مردن‌و پێش مردنیان ، کراوون ، دەریان خستووە کە بەشێوی‌و بشێوی دەروونی بە هیچ جۆرێك نابێتە هۆی داهێنان ، بەڵکو زۆربەی زۆری داهێنەرو بلیمەتەکان چ لەبارەی دەروونی‌یەوە ، وچ لەبارەی کۆمەلایەتی‌یەوە ژیانێکی ئاسوودەگیان بووە هەرچەند هەندێکیان ، ژیانی کۆمەڵایەتی‌و دەروونی‌یان ، ئاسایی‌و ئاسوودەگی نەبووە ، وەکو : فریدریك نیتشەو ئەو زانایانەو بلیمەتانەی یاسان کردن، ئەویش تینی نەکردۆتە سەر بەرهەمەکانیان .

---

(٢٦) الامراض النفسية والعصبية ـ اعداد محمد رفعت ـ دار المعرفة للطباعة والنشر ـ بيروت ـ لبنان ص٣٤ .

لـە لایەکی تریشەوە هیچ دوور نی‌یە ، کە ئەم بوختانانەیان ، بۆ هەڵبەستراپێت ، چونکە (بلیمەتان) بەو هەموو زیرەکی‌یەوە لـە کۆمەڵ بڕدەبن نەك هەر ئەوان بەڵکو هەموو کەسێك کە ویستێتی باری کۆمەڵ بگۆڕێت ، تا سەرکەوتووە ، تووشی چەرمەسەریی‌یەکی زۆر بووە، هەشیانە تا لە ژیانا بووە ، نرخی ڕاستی‌و شوێنی ڕاستی خۆی پێ نەدراوە وەکو : دەگێرنەوە جارێکیان ، یەکێك لە کوڕەکانی ( قانع )ی شاعیر ، لە شاری ( موصل ) لە سەفەر دەگەڕێتەوەو دەڵێت : بابەگیان ، لە شاری ( موصل ) کۆگایەکیان بە ناو تۆوە ناو ناوە ( کوگای قانع ) ، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت ڕۆڵە باوەڕ مەکە چونکە هێشتان نەمردووم .

پرسیارێکی دیکەش خۆی ئاشکرا دەکات‌و دەڵێت ئایە ( مرۆڤی بلیمەت ) ، یان (بلیمەتان) لە هەموو گەلێك‌و نەتەوەیەکدا هەڵدەکەوون ؟ ئەگــەر وایە بۆچی هەندێ نەتەوەو هەندێ گەل لـە هەندێـکی دیکە پێشکەوتووترن ؟ یان بۆچی ئەمریکاو ئەوروپایی‌یەکان ، ئەفریکاو زۆر وولاتی دیکەیان داگیرکردووە ؟ لە وەڵامدا دەڵێن : زیرەکی‌و بلیمـەتی تەنها بۆ سەر نەتەوەیەك ، یان بە سـەر مرۆڤانی چـەند نەتەوەیەکـدا نەدراوەو نەبڕاوە چونـکە زیرەکی بە دەنگ نی‌یە و بە ڕەنگ نی‌یەو بە بالآنی‌یەو بە سـەروو سیما نی‌یە ، بەڵکو هەموو نەتەوە هەموو گەلێك ، چ لە ئەوروپا بێت‌و چ لە ئەمەریـکا بێت‌و چ لەئاسیادا بێت هـەموویان بلیمەتیشیان هـەیەو زەین ڕوشنیش‌و زەین کوێریشیان هـەیە ، بەلآم مرۆڤی بلیمەت هەر وەکو تۆوی ڕووەك وایە ، چۆن تووی ڕووەك ، با بڵێن (گـەنم) با توخمەکەیشی تۆوەکەیشی باش‌و ڕەسەن بێت ، ئەگـەر لە زەمینێکی ( گلێکی ) باشـدا تۆو نەکرێت‌و دوایی بژار نەکرێت‌و بـە باشی پارێزگاری نەکرێت‌و پەروەردە نەکرێت ، هەڵناکەوێت ئاوەهـاش

مرۆڤی بلیمەت لەو وولاتانەدا کە پێشکەوتوون ، بەباشی پەروەردە دەکرێن‌و هەموو ئامرازێکی داهێنانیان بۆ ئامادە دەکرێت بەڵام مرۆڤی بلیمەت لە وولاتی ئێمەدا ، یان لە وولاتە تازە پێشکەوتووەکاندا ناتوانرێت ئەو پارێزگاری‌یەو پەروەردە باشە بکرێت ، ئەمەش پەیوەندی بە زرووفی ڕامیاری‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابوری‌یەوە هەیە ، بێجگە لەمانەش دەوڵەتە پیشەسازی‌یە ئەمپریالیزمەکان ، هەمیشە هەوڵ دەدەن بە پارە ، یان بە زۆر ، یان بەدزین ، ئەو مرۆڤە گەورە بلیمەتانە بەرن ، بۆ نموونە ئەو مانگە دەستکردە ئەمەریکی‌و سۆڤێتیانەی کە لە سەر مانگ نیشتەوە پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر دروست کەرەکانیان ئەڵمانی بوون . دوای جەنگی جیهانی دووەم برابوون بۆ هەردوو وولاتەکە ، ئێستە زۆریان لەویانە ماوون ، قوتابیشیان زۆرن‌و وزووریش خزمەتیان بەوان کردووە ، لە لایەکی دیکەوە زۆر لەو کانگەو کارگە و قوتابخانەو دەستگایانەی کە لە وولاتە تازە پێشکەوتووەکاندا ، منداڵە بلیمەتەکانیان تێدا پەروەردە دەکرێن ، داگیرکەرەکان ، تەگەرە دێننە ڕێگەیان لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت پێشکەوتن‌و دواکەوتن پێوەندی بە باری ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و ڕامیاری‌یەوە هەیە ، داگیرکردنیش پەیوەندی بەهێزو دەسەلات‌و باری جوگرافی‌و چەند هۆیەکی دیکەوە هەیە .

# نیشانەکانی کەسێتی بلیمەت

ئایە هیچ نیشانەو سیفاتێك بۆ کەسێتی بلیمەت هەن ؟
بە ڕاستی چـــەند نیشانەو سیفاتێك ، بۆ کەسێتی بلیمەت ، دیاری کراوە •

مرۆڤی(٢٧) بلیمەت ، بە لای داروین‌و سینسەرەوە ، ئەو کەسەیە کە قەبارەی ( مێشکی ) ئاسایی نەبێت ، بەڵـکو لە قەبارەی ( مێشـکی ) کەسانی دیـکە گەورەتر بێت بەڵام دەروونزانیی تازە ئەم ڕایەی بـە درۆ خستۆتەوەو چـەند نیشانەو سیفاتێکی دیـکەی بۆ دەست نیشان کردووە دەروونزانی نوێ بە ووردی ئەو حاڵەتە باس دەکات ، کە چۆن مرۆڤی بلیمەت شت دادەهێنێت‌و بە چ شێوەیەك دای دەهێنێت ، بـەڵام باش وەهایە کـە لەو منداڵەوە دەست پێبکەین کـــە لەوانەیە ببێـتە کەسێتی‌یەکی بلیـمـەت •

١ ـ ئەو منداڵە خەیاڵی زۆر بەهێزە •

٢ ـ حەز بە زانین‌و پشکنینی زۆر دەکات •

٣ ـ ئارەزووی داهێنانی زۆرە •

---

(٢٧) ـ اعرف نفسك ـ دراسة سايكولوجية ـ تاليف ـ دكتور فاخر عاقل ط١ بيروت ١٩٦٤ •

چەند زانایەکی دیکە چەند نیشانەیەکی دیکەیان بۆ مرۆڤی بلیمەت هەستنیشان کردووە وەکو

١ ـ مرۆڤی بلیمەت زۆر هەستیارەو هەستی بەهێزە ، مەبەست بە هەستیاری بلیمەت ، ئەوەیە کە لە هەموو بارێکەوە ، کە کاتێك هەستی هەلگرت توانای هەڵچوونیشی بەهێزو لێشاوە ، هەروەها توانایەکی زۆری هەیە لە سەر شیتەڵ کردنی شتو پەیوەندی دۆزینەوە لە نێوان پارچەکانیدا ، مرۆڤی بلیمەت هێزە هەستیارێکەی هانی دەدات بۆ تاقی کردنەوەو ئەنجامدانیو کەڵك لێ وەرگرتنی ، چونکە هاندەرەکەی ناو خۆییە ، هەر خۆی لەزەتی لێ وەردەگرێ •

٢ ـ مرۆڤی بلیمەت زۆر بە توانایە لە سەر بیرکردنەوە ، کاتێك کە دەڵێن : بە توانایە لە سەر بیرکردنەوە ، مەبەستمان ئەوەیە کە بیر کردنەوەکەی هۆیەکی زۆر گرنگە لە داهێنانو دروست کردندا ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە خەیاڵ کردنو شیتەڵ کردنو پەیوەندی بەستنو دەرکی بەیوەندیو چارە دۆزینەوە بۆ تاقی کردنەوەیەکی هەستیاری ، هەموویان پیویستیان بە بیر کردنەوە هەیە بیر کردنەوەیەکی زۆر بەهێزیش ، لە زیرییەکی زۆر بەهێزەوە هەڵدەقوڵێت •

٣ ـ مرۆڤی بلیمەت توانای زۆری لە سەر جموو جۆوڵو چوستی هەیە ، ئەم نیشانەیەیان کەڵکی لێ وەردەگیرێت ، بۆ بەیەکەر تاشیو هونەری سەما •

بلیمەتیو داهێنانەکە خۆی ، لە تێکەڵاو بوونی توانای یەکەمو توانای دووەم دروست دەبێت •

(ستودارد) دەڵێت : مرۆڤی[٢٨] بلیمەت ئەو کەسەیە کە جۆرە گورج و گۆڵی یەك ئەنجام دەدات کە

١ ـ گرانن . giranin

٢ ـ ئاڵوسکاوون aloshawin

٣ ـ ڕوونن . rûtin

٤ ـ لە کاتی ئەنجامدانی گورج و گۆڵی یەکەدا ، لە هەوڵ و لە کێش دەگرنەوە واتە : بە کەمترین هەوڵ و بە کورترین کات ، ئەنجامی دەدەن .

بە کەمترین هەوڵ
کات

٥ ـ ئامادەن بۆ ئامانجێکی تایبەتی .

٦ ـ نرخێکی کۆمەڵایەتی یان تێدا هەیە .

٧ ـ رەسەنن ، واتە چالاکی یەکانیان گورج و گۆڵی یەکی ڕەسەنن .

ئایا مرۆڤی بلیمەت چۆن دادەهێنێت و دروست دەکات ؟

بە ڕاستی بۆ ئەوەی وەڵامەکەی تەواوو ئاشکرا بێت ، ئەم پرسیارە لە خۆیان کراوە ، وەڵامیان ئەمە بووە ووتوویانە :

مرۆڤی بلیمەت ، بۆ ئەوەی کردارێکی بێ هاوتا دروست بکات ، کارەکەی بە چوار سووڕدا تێدەپەڕێت .

**سووڕی یەکەم :**

سووڕی ئامادەیی یە لەم سووڕەدا هەموو هەوڵ و هێزێکی ئامادە

---

(٢٨) علم النفس وتطبيقاته التربوية والاجتماعية ـ الدكتور عبد علي الجسماني طبعة منقحة مزيدة ١٩٨٤ ص٦٣ .

دەکاتو ئاراستەی کۆسپەکەی دەکات ، واتا : ئەو شتەی کە دەیەوێت دای بهێنێتو ، لێی بووە بە خولیا .

**سووڕی دووەم :**

سووڕی پاڵدانەوەو پشت کردنەوەیە ، لەم سووڕەدا کۆسپەکە بەرەڵا دەکات ، بە بێ گوێ دانو ئاگاداری یەك ، واتا : پشت گوێی دەخاتو ئەو گرنگی یەی نادانێ ، وەکو : کەسێك بۆ کارێکی قورس هەوڵ بداتو مسۆگەری بکات ، ئەمجا بە شێنەیی لێی بجوولێتەوە . ئەم سووڕە وەکو پشوودانێك ویله بڕینێك وایە .

**سووڕی سێیەم :**

سووڕی ڕووناکی یە : لەم سووڕەدا ، هەر لە پڕیە کەندەردوو بە تیژ تیەرێك ، چارەی کۆسپەکە دەدۆزێتەوە واتا : شێوەو نەخشەی داهێنراوەکە دێتە پێش چاوی .

**سووڕی چوارەم :**

سووڕی جێبەجێ کردنە : واتا لەم سووڕەدا چارەی کۆسپەکە دەکات ، یان بابڵێن : نەخشەکە جێبەجێ دەکات .

خوێنەری بەرێز : ئاتێنە (١٩) نۆزدە جۆری کەسێتیمان بۆ پێناسەو باس کردی ئەوەشمان بۆ دەرکەوت کە نیشانەکانی کەسێتی ، چەند جۆرێکیان ، زۆر لە یەکدەچنو بە یەکدا چوون ئەویش شتێکی سروشتی یە لە مرۆڤدا .

لە لایەکی دیکەوە ، ئەو کەسێتی یانەی کە نالەبارن ، مەرج نی یە

گەیشتێتە ڕادەی نەخۆش کەوتن ، یان نەخۆشی دەروونی گرتن ، بۆ نموونـــە :

شێزەکەسێتی تووشی نەخۆشی شیزوفرینیا نەبووە ، بەڵام ئەگـــەر لەو سنوورە تێپەڕێت تووش دەبێت .

هەروەها کـەسێتی هێستیری ، یان کەسێتی سایکۆباسی ، تووشی نەخۆشی دەروونی هێستیریا ، یان نەخۆشی دەروونی سایکۆباسی نەبوون بەڵام ئەگـەر نیشانەکانیان زیاتر پە بسێنێت ، یان بەرەو باش نەگۆڕێن دوور نی‌یە تووشی ئەو نەخۆشیانە بن ، هەروەها کەسێتی سەپێراو .

خوێنەری بەڕێز جۆرەکانی کەسێتی مرۆڤ گەلێك لەم ژمارەیە زیاترن کەباسمان کردن ، وەکو :

کەسێتی پێشەوا ، کەسێتی لەسەر خۆ ، ناسکەکەسێتی ، کـەسێتی لوتبەرز ، کەسێتی فێڵباز ، کەسێتی دەمباز ، توندەکەسێتی ، کـــەسێتی ئاشتی خواز .. هتد ..... بەڵام بە پێویستی نازانین لەسەریان بڕۆین .

# چۆن دەبیتە کەسێتی‌یەکی سەرکەوتوو ؟

خوێنەری بەڕێز : مەبەست بە کەسێتی سەرکەوتو ، ئەو کەسەیە کە بتوانێت کار بکاتە سەر کەسانی دیکەو قسەکانی پەیرەو بێت‌و ڕێزی هەبێت‌و بتوانێت ژیانێکی سەرکەوتووانە لە کۆمەڵدا بۆ خۆی دروست بکات ، ئەمەش وا دیارە لەبەر ئەوەیە ، کە چەند نیشانەو رەفتارێکی تایبەتی تێدا هەن ، بۆیە ئەو دەسەڵات‌و توانایەی هەیە .

ئەی باشە ئەگەر هاتوو تۆ ئەو نیشانانەت تێدا لاواز بوو ، واتە کەسێتی‌یەکی لاوازت هەبوو ، ئایە دەتوانیت تۆش نیشانەو سیفاتەکانت بەهێز کەیت‌و چەند سیفاتێکی باشتریش لە خۆتا بڕسکێنیت‌و خۆت لە سەریان ڕابهێنیت‌و تۆش بێتە کەسێتی‌یەکی سەرکەوتو ، تین بکەیتە سەر کەسانی دیکەو ڕێزو شوێنێکی تایبەتیت لە کۆمەڵدا هەبێت یان ناتوانێت ؟

لە وەڵامدا ، دەڵێن : تۆش دەتوانیت‌و هەموو کەسێکی دیکەش دەتوانێت ئەمیش لە بەر چەند هۆیەك

١ ـ مەبەستمان بە سەرکەوتن ، ئەوە نی‌یە کە تۆ هەستیت ڕووی مێژو بگۆڕیت‌و یان باری کۆمەڵایەتی لەبنەڕەتدا دەربهێنیت‌و بە بارێکی باشتردا بیگۆڕێت‌و بیخەیت ، یان مەبەستمان ئەوە نی‌یە کە ئەوپەڕ (تەموح)و سەرکەوتنت هەبێت ، بەرزترین ئامانج لەشەوو ڕۆژێکدا

بهێنێته دی ، وبیێته ( یەکشەوه ) ، بەڵکو مەبەستمان بە سەرکەوتن ، سەرکەوتێکی ڕەوانی ئاساییە ، خۆ گونجاندنو کەڵك بەخشینە بەخوو بە کۆمەڵ ، وەکو : مامۆستایەکی سەرکەوتو ، پزیشکێکی سەرکەوتو ، بازرگانێکی سەرکەوتو ، قوتابیەکی سەرکەوتو وەکو کەسێك کە گیانی یارمەتیو هەروەزی تێدا هەبێت .. هتد ....

واتای وا نییە ئێمە دژی ئەم جۆرە گۆڕانانەین ، یان ئەو گۆڕانانە کارێکی نەکردەن چونکە ئەو کارە گەورانە ، وەکو ڕووی مێژوو گۆڕین ، یان کاروباری کۆمەڵ خستن بە بارێکی باشتردا ، لە دەستی هەموو کەس نایەت ، بەڵکو لە دەستی کەسانێك دێت کە بلیمەتنو ژمارەیان بە پەنجەی دەست دەژمێرێت ، یان چەند بارێکی مێژوییو جوگرافیو ڕامیاریو ئابووری کۆمەڵایەتی تایبەتی دروستیان دەکات ئەو جۆرە هەلانە ، بۆ منو تۆ نارەخسێت ، و تا ئێستە نەرەخساوە مەبەستم ئەوە نییە کە تۆ هەوڵ مەدە ڕوی مێژوو بگۆڕێت ، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ئەگەر نەت توانی ، سەرنەکەوتی خەفەت مەخۆ .

٢ ـ کارتێ کردنی مروف لە کەسانی دیکە ، ڕواڵەتێکی گشتییەو تایبەتی نییە ، تەنها کەسێك ، یان چەند کەسێك ، ئەم توانایەی نییە چونکە کارتێ کردن لە دەروونی مرۆڤەکەوە هەڵدەقوڵێت ، ئەویش وەکو : بیرکردنەوە وایە ، هەموو کەسێك لە ئێمە بیر دەکاتەوە ، هەموو کەسێك لە ئێمە خوشییێو ترشییێ ، و پێ بزانێت و پێ نەزانێت ، کارو تین دەکاتە سەر کەسانی دیکە ، کردەوەی بە ڕەواجی هەیەو قسەی بە بڕەوشی هەیە ، بە هۆی تینو تیشکێکی تایبەتییەوە ، ئیتر ئەم کارتێکردنە دوور بڕوات ، یان نیزیك ئەوەش دەگەڕێتەوە ، بۆ ڕادەی بەهێزیو بێهێزی ، ئەو کەسێتییەی جاران وایان

دەزانی کــە کەسێتی سەرکەوتوی بەهێز لای ئەو کەسانەیە ، دیمەنێکی جـوان و شانو بازویەکی بەهێزیان هــەیەو سەروسیمایەکی بەسامو ترسناکیان هەیە ، بەڵێ ڕاستە خەڵـکی هــەر وەکو چۆن لــە دەوری ئاگردانی زستــان کۆ دەبنەوە ، ئاوەهاش لـە دەوری کەسانێك پوورە دەدەنو کۆدەبنەوە ، کەلە پالیاندا هەست بە ئارامو خۆشی بـکەن ، کـە لەشیان بەهێزو ، بە دەستەڵاتو توانا دارن ، لەگـەڵ ئەوەشـــدا زۆر کەسیش هەن سەرو قەسالێکی ناشیرینیان هەیەو لەشێکی لەڕو لاوازو قەبارەیەکی پچووکو بوودەڵەیان هەیە ، و بە ڕادەیەکی ئەوتۆش کـــار دەکەنە سەر کەسانێکی دیـکە قسەکانیان لایان ڕەواجی هەیە ، مرۆڤ ســەری سووڕ دەمێنی • لەم دوو خاڵەوە بۆمان دەرکـەوت ، وەکو لە سەرەتای دابەشکردنی کەسێتیدا ، باسمان کرد ، هــەموو کەسێك کەسێتی هەیە ، بەڵام هەیە کەسێتییەکی سەرکەوتووی هەیە ، هەشـــە کەسێتییەکی نەخۆشی هەیە هەشە کەسێتییەکی دواکەوتووی لاوازی هەیە مرۆڤیش بە دەستی خویەتیو دەتوانێت ، کـەسێتی بەلاوازەکـەی بەهێزو ســەر کەوتوو بـکاتو بیگورێت بۆ سەرکەوتوویەکی بەناوبانگ بە مەرجێك پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات :ـ

١ ـ پارێزگاری تەندروستی خۆت بـکە •

٢ ـ ئەگەر ناتەواویەکی لەشیت هەیە ، هەست بە کەمسەری مەکەو بیری لێ مەکەرەوە ، بەڵکو بتوانی لە ژیانتا ، چۆن خۆت سەر دەخەیت، ئەوەش بزانە چەندەها لـە پێشەوا وپیـاوە مێژوویەکان یان شەلبوون، یان ناتەواوییەك ، هەبووە لــە ئەندامێك لە ئەندامەکانی لەشیاندا ، بۆ بۆنمونە : تەیمووری لەنگ ، شەلبووە ، پیتهۆڤن کەڕ بووە ئەبوعــەلای

مەعەری کوێر بووە ، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵکەوتەو بلیمەت بوون .

٣ ـ هەرگیز بیر نەکەیتەوە لە سەرنەکەوتن ( الفشل ) ، بەڵکو هەمیشە بیر لە سەرکەوتن ( النجاح ) بکەرەوەو هەوڵی بۆ بدە ، بەلاّم بە ڕێگەی ڕاست و ڕەوان ، نەك لە سەر حسابی ئەمەو ئەو ، نەك بە ڕێگەی ناڕەواو چەوتەو چێڵوگزی ، ئەگەر بە ڕێگەیەك سەرنەکەوتیت بگۆڕەو ڕێگەیەکی دیکە تاقی کەرەوە .. هتد ....

٤ ـ باوەرت وا بێت کە هیچ کۆسپێك و تەگەرەیەك نی یە ، چارەی نەبێت ، بەڵکو هەموو کۆسپەو تەگەرەیەك چارەی هەیە . کاتێك کە کۆسپێك ڕێگەت پێ دەگرێت هیچ مەشەڵەژێ ، بەڵکو بە هێواشی و لە سەرخۆ ، بەبەرەو پیری بڕۆ و بیری لێ بکەرەوە ، تا لا دەچێت .

٥ ـ کارەکەت خۆش بوێت ، لە یەك کاتدا دووەێ کار مەگرە دەستەوە ، چونکە ئەو کاتە هیچیانت بۆ ئەنجام نادرێت ، بەڵکو کارێك تەواو کەو ئەمجا دەست بدەرە کارێکی دیکە ، وەکو پەندە کوردی یەکە دەڵێت

هەشت بێت لە مشت بێت ، نۆ بێت نەك نەبێت .

٦ ـ هەر کارێکت هەیە بە گورجو گۆڵی دەستی بەرێو ئەنجامی بدە .

٧ ـ واز بێنە لەو ڕەفتارانەی کە کۆمەڵ پێی ناخۆشەو پەسندیان ناکاتو دەیان بێزێنێت .

٨ ـ باشترین سیفاتی نیشتیمان پەروەری و نەتەوەگەری ، لە خۆتا بڕسکێنە چونکە هەڵگرتنی ئەم سیفاتانە پارێزگاری باری ئازادیو ڕزگاری نەتەوەکەتو نیشتمانەکەت ، دەکەنو ئەو کاتە کۆمەڵ نرخت

بەرز دەکاتەوە ، چونکە ئێمە لەچەرخی ئەمانەدا دەژین •

٩ ـ لە بیرو باوەڕی شوڤێنیو ڕێڕەوی کوێرانەی خۆپەرستی لادە•

(١٠)ـ بەرگی تەسکی هۆزەگەریو تیرەگەری داماڵەو ، بەری نەتەوەیی گشتی کوردی بپۆشە •

١١ـ تا ڕادەیەك گرنگی بە جلو بەرگو هەڵبژاردنی جۆرەکانی،و ڕەنگەکانی بدەو قەڵافەت رێك‌بخە ، هەرچەند جلو بەرگ مەرجێکی بالا نی‌یە بۆ دروست بوونی کەسێتی‌یەکی باش ، لەبەر ئەوە کە باسی کەسێتی‌یەکی مێژوویی دەکرێت ، کەس نابرسێت چی لەبەر کردووە ؟ وەگرنگدان بە جلو بەرگیش واتای وا نی‌یە ، جلو بەرگی گران بەهاو، نرخ گران ، نرخی مرۆڤ بەرز دەکەنەوەو کەسێتی سەر دەخەن ، بەڵکو جلو بەرگی نرخ‌گران لە کۆمەڵێکی نەناسراودا ، نرخی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە •

١٢ـ تێکەڵاوی کردن : چەندێك بۆت دەلوێت ، ئەوەندە تێکەڵاوی کەسانی دیکە بکە ، هاشۆو رەوت هەبێت ، چونکە تێکەڵاوی دەوڕێکی زۆر گرنگی هەیە ، لەپەروەردە کردنو قاڵ کردنی کەسێتی مروڤدا ، چونکە کەسێتی بە تێکەڵاوی بەهێز دەبێتو بەڕێز دەبێتو ناوبانگ پەیدا دەکات •

١٣ ـ یارمەتیو هەرەوەزی کردن : تا دەتوانیت ، یارمەتی کەسانی دیکە بدەو هەرەوەزی‌یان لەگەڵ بکە ، چونکە ئەم دوو نیشانەیە روخساری مرۆڤ سووك دەکەنو قسەکانی پەیڕەو دەکەن •

١٤ ـ هاوڕێتی لەبەر ئەوەی هاوڕێ دەورێکی بالا لە ژیانی مرۆڤدا دەبینێت ، هاوڕێ باش بگرە ، پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت

« مەل هەیە گۆشت دەخوات‌و مەلیش هەیە گۆشتی دەخورێت » •

ئەمجا ئەگەر زانیت ، تۆ خۆت ناتوانیت ببیتە پێشڕەوی هاورێکانت‌و تین‌و کاریان تێ بکەیت ، ڕەووشت‌و خووە خراپەکانیان بگۆڕیت ، ئەوە ئەو کاتە نەکەیت هاوڕێی خراپ بگریت‌و لەگەڵ هاورێی خراپ‌و تەمەڵ‌و دەستەو وسانو خوو ڕەووشت ناپەسندا بکەڕێیت ، ئەگەر بە خۆتا ڕابەرموو بتوانیت کاریان تێ‌کەیت‌و خوو ڕەووشتی خراپیان بگۆڕیت ، ببیتە هۆی ئەوەی لە زیاندا سەریان خەیت‌و ببیتە پێشەواو نموونە چاووت لێ بکەن‌و بە قسەت بکەن ئەو کاتە هاورێی خراپیش بگریت زیانی نی‌یە ، چونکە جاری وا هەیە هاوڕێ تووشی جگەرە کێشان‌و قومار کردن‌و سووڕانەوەی بێ هودەت دەکات ، هەر وەکو چۆن هاوڕێی باشیش ، لە وانەیە ئەم خووە ناشرینانەت پێ تەرك کات •

من خۆم چەند جارێك هاوڕێی خراپ ، فێری جگەرە کێشانی کردووم‌و جگەرەی‌داوە پێم‌و دووایی کە زانیوێتی تەواو فێری جگەرە کێشان بووم ، ئەوجا جگەرەی نەداوە پێم‌و پێاما هەڵکالیوە ، وتوویەتی ئەوە عەیب ناکەیت ، جگەرە بۆخۆت ناکڕیت‌و لەم‌لاو لەولا لامێژی دەکەیت‌و بەسەر کیسەو قوتوی ئەم‌و ئەوەوە دەلەوەڕێیت ؟ لەگەڵ ئەوەشدا جارێکیان هاوڕێ یەکی باشم هەبوو جگەرەی بی تەرك کردم‌و قایلی کردم کە جگەرە کێشان زور زیان بەخشە ، ڕێگەیەکی بێ نیشاندام کە بەکاری بێنم ، ڕێگەکەش بریتی بوو لەوەی کەسوێن بخۆم لە بەیانی تا ئێوارێ جگەرە نەکێشم‌و دان بە خۆما بگرم • ئێوارێ سوێندەکە تازەکەمەوە ، بۆ ئێوارەی دووایی ، هەروەها لەو ماوەیەدا کە دەچوینە دیدەنی کەسێك ، یان دەچووینە میوانی ماڵێك پێش‌بڕی لێم

دەکردەوە ، دەی ووت : فلان وازی لە جگەرە هێنا وەو جگەرەی مەدەنێ .

من ئەو کاتە هەرچەند لە دڵی خومەوە ئەو چاکەیەم بە خرابە دەزانیو پێم ناخۆش بوو ، چونکە خۆشترین هەڵی لە کیس دەدام و جگەرەیەکی ڕۆسمەن ، یان دیمۆری ، یان ( لارك )ی لە کیس دەدام ، بەڵام ئێستە هەرچەند یادی ئەو هاوڕێ باشە ، دەکەمەوەو کردەوە جوانەکەیم هەرگیز لەیاد ناچێت ، ئێستاکێ دەزانم کە ئەو هاوڕێیە چەندێك دڵسۆزی من بووە .

بەڵام ئەو ڕێگەیە باشترین ڕێگە نی یە بۆ وازلێهێنان لە جگەرە ، بەڵکو باشترین ڕێگە ئەوەیە کەویستو بڕیارت بەهێز کەیتو یەکەری فرێی دەیتو وازی لێ بهێنیت ، ئەو پارەیەی لە جگەرەدا خەرج دەکرێت تا ماوەی یەك دوو مانگێك لەشتی زیادەدا خەرج کرێت ، وەکو : کڕینی چەرەسی زۆرگران ، یان خواردەمەنی نرخ گران . بۆ ئەوەی دیوی ( بێ هەستی ) مرۆڤ وا نەزانێت لەبەر ( دراوەکە ) وازی لێ دەهێنێت ، و ویستو ، بڕیاری جگەرە کێشەکە بێهێز بکات .

### ١٥ ـ قسە کردن :

## خوێنەری بەڕێز

هیچ بەلاتەوە ناخۆش نەبێت ، کە کاتێك ئەم ئامۆژگاری یانەت لەبارەی قسەکردنەوە ، پێشکەش دەکەم ، چونکە ئەگەر هەموو کەسێك لە ئێمەی ئادەمیزاد ، بیزانیایە چۆن قسە دەکاتو چۆن دەدوێت ئێستە سەر زەمین چەندێك جێگەی شەڕو جەنگو کوشتنو بڕینو خوێن ڕژاندنو ستەم کردن نەدەبوو ، دە ئەوەندە جێگەی ئارامو ، ئاسایشو ،

کامەرانی‌و خۆشەویستی‌و دادپەروەری مافپەوایی دەبوو ، چونکە زمان (قسە) ئامرازی پێشکەوتن‌و تێ گەیاندن‌و لە یەك گەیشتن‌و ناکۆکی لابردنە ، ئەو کەسەی کە نازانێت بە باشی بدوێت‌و قسە بکات ، ئەگەرەیەکە لە ڕێی زیاندا هەر بۆیە ووتراوە ، خوایەنەم خەیتە ژێر دەستی نەزانەوە داماوی دەستی نەزانم نەکەیت ، تا ڕۆژێك بوو ئەمرازی لەیەك گەیشتن قسەی ڕووت بوو ، ڕۆژی پەیمان‌و درۆ نەکردن بوو ، سەرزەمین بەهەشت بوو ، چونکە خەڵکی خاوەن قسەی خۆیان بوون ، بەڵام ئێستە کە ( ڕامیاری ) بە واتای ئەم چەرخە لەباو دایە ، ئامرازی تێ‌گەیشتن ولەیەك گەیشتن ، بەرژەوەندی تایبەتی‌یە ( المصالح) لە نیوا ندا ، سەرزەمین لە زۆر شوێندا بۆتە پارچەیەکی ئاگرو داماوی ڕسوایی‌و گۆزە بە دیزە دەکرێت ، هەرچی چۆنێك هەبێت(قسەی خۆش دەرمانی زامە ، قسەی ناخوش‌و نەزان دووان ، خەنجەری ژەهراوی یەم

تۆ بزانە لە زیانی ڕۆژانەندا ، چەندێك دلگیر دەبێت ، کە دەبینیت لە فەرمانگە یەکدا ، فەرمانبەرێك ، کە بو ئەوە مووچەی بۆ بڕاوەتەوە کاری من‌و تۆ بە ڕوویەکی خوشەوە ، بە زمانێکی شیرین ، ئەنجام بدات ، لەگەڵ ئەوەشدا ، پیاتا هەڵدەکاتێت‌و نازانێت زمانی بەکار بهێنێت‌و قسە بکات .

ئایە لە دلی خۆتدا ، نالێیت خۆزگە دەستەلاتم دەبوو قوتابخانەیەکم بۆ جۆری ئەم فەرمانبەرانە دەکردەوە ، بۆ ئەوەی فێری قسەیان بکەم ؟

یان نالێیت : خۆزگە هەر کار بە دەستێك پەیوەندی ڕاستەو خۆی بە جەماوەرەوە دەبوو ، خۆزگە هەر بەینە نابەینێك ( خولێکیان ) بۆ بکردایەوە ، هەر لەبەر ئەوەی فێری قسەکردن‌و دەروونزانی

کۆمەڵایەتی بونایەو فێری ئەوە بیوونایە ، کە چۆن کردەوە لەگەڵ ئەمو ئەودا بکەن ؟

ئایە نازانیت لە زۆر وولاتدا قوتابخانە کراوەتەوەو یان پەیمانگە دامەزرێنراوە ، بۆ فێر کردنی چونێتی قسە کردنو ووتو وێژ کردن ، یەکێك لەو پەیمانگەیانە ، پەیمانگەی پەیوەندی مرۆڤایەتی‌یە کە ( دیل کارنێژی[29] ) ئەمەریکی لە شاری نیویورك دای‌مەزراندووە .

ئێستە دێینەسەر ئەو ئامۆژگاریانە کە لە کاتی قسەکردنو وتووێژ کردندا ، پێویستە پەیرەوی بکرێن هەرچەند ئەم کابرایە ئەم ئامۆژگاری‌یانەی لە گیرفانی‌خۆی دەرنەکردووە ، بەڵام کەڵکیان هەیە :ـ

١ـ١٥ـ ئامانجی سەرەکیت لەووتو وێژکرندا گەیشتن بە ڕاستی‌و ماف‌وو ڕەوا ئاشکرا کردن بێت ، نەك مەبەستت مـەلا بەزێنی‌و کۆلەکەدان بێت .

٢ـ١٥ـ لە کاتی قسەکرندا ڕووت خۆشکەو قسەت خۆش‌کەو زوو هەڵمەچۆو تووڕە مەبە ، لەم بارەیەوە پەندێکی چینی هەیە دەڵێت :

ئەو کەسەی نەزانێت ڕووی خۆی خۆش کات نابێت فرۆشگە بکاتەوە .

٣ـ١٥ـ بە چاوی سووك تەماشای بەرامبەرەکەت مەکە ، ڕێزی ڕاکانی بگرەو مافی خوی بدەرێ ، چونکە ( هەموو کەس لە کراسی خۆیدا پیاوە )و خۆی بە پیاو دەزانێت ، ئەو کەسەی ڕێزی خەڵکی بگرێت ، ڕێزی خۆی دەگرێت .

---

(٢٩) كيف تكسب الاصدقاء ، وتؤثر في الناس ـ تاليف ديل كارنيجي ط٥ ١٩٥٨ مطبعة السنة المحمدية في مصر ص٢٠٧ .

٤ـ١٥ـ بە باشی گوێ بگرە بۆ قسەی بەرامبەرەکەت ، ڕێگەی بدەرێ با ئەویش قسەی خۆی بکات ، ئەگەر هەر بێ دەنگ بوو ، بیجوڵێنە ، با بێتە قسە ، کە قسەی کرد ، قسەکانی پێ مەبڕەو ڕەخنەی لێ مەگرە تا وەکو لێ دەبێتەوە ، ئەو کاتە مشتومڕی لەگەڵ بکە ، ئەگەر وا بکەیت لە قسەکردندا دەست پێشکەری بکات ، ئەوە باشترە •

٥ـ١٥ـ کاتێك کە قسە بۆ کەسێك دەکەیت ، وا بزانە قسە بۆ هاوڕێیەکی خۆشەویستت دەکەیت ، ووتراوە ( بە قسەی خۆش مار لە کون دێتە دەرەوە ) •

کابرایەکی ئەمریکی دەڵێت : ئێمە مانگا لە بەر شیرەکەی بە خێو دەکەین ، کەناری لەبەر دەنگە خۆشەکەی ، بەڵام سەگ لەبەر خۆشەویستی‌یەکەی بەڵام ئێمەی کورد سەگ ڕادەگرین لەبەر پاس‌و بە وەفایی‌یەکەی •

٦ـ١٥ـ بەرامبەرەکەت مەشکێنە ، بە زۆر مەیهێنە سەر ڕاکانت‌و بیرو باوەڕی خۆتی بە زۆر بەسەردا مەسەپێنە ، چونکە بستێك بڕ ناکات، ئەگەر بە ڕواڵەت خۆی وا دەرخات ، کە باوەڕت پێ دەکات ، لە ناخی دەروونیدا لە سەر بیرو باوەڕی خۆی دەمێنێتەوەو درۆت لەگەڵ دەکات ، واتای وایە ئەو کاتە تۆ هەڵخەڵەتاویت •

٧ـ١٥ـ ڕاستەو خۆ بە رامبەرەکەت بە درۆ مەخەرەوە ، چونکە بە شکاندنی دەزانێت ، بەڵکو ڕایەکی ڕاستی بۆ ئاشکرا بکە ، کەوا بزانێت ڕای خۆیەتی وە لە جەرگەی بیرو ڕای ئەوەوە دێتە دەرەوە •

٨ـ١٥ـ کاتێك کە قسە دەکەیت ، بزانە لەگەل کێ قسە دەکەیت ، ئەو کەسە گەورەیە ، یان منداڵە ، پیاو ، یان ئافرەتە ، خوێندەوارە ، یان

نەخوێندەوارە ، چونکە هەر کەسەو پلەیەکی تایبەتی دەوێت ، لە ڕادەی شێوازی قسەکردندا .

(٩) ١٥- ئەگەر لە کاتی قسەکردندا کەوتیتە هەڵەیەکەوە ، کوتوپڕ دانی پێدا بنی‌و پەشیمان بەرەوە ، دانانان بە هەڵەدا کردەوەی کەسانێکە کە باوەڕیان بە خۆیان هەیە ، چونکە بەمە گەردنی خۆت سەرفراز دەکەیت و گرێیەك ، لە دەروونت نادەیت ، یان گرێیەك لە دەروونتا دەکەیتەوە پێش ئەوەی بئالۆسکێت‌و ببێتە گرێ کوێرە .

١٠-١٥- بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەت بە ( بەڵێ )و (نەخێر) وەڵامت بداتەوە ، ڕێگەی سوکرات بگرە لەوتوووێژ کردندا .

سوکرات هەرچەند سەروفەساڵێکی ناشیرین‌و ڕەزایەکی قورسی هەبوو تووك بە سەریەوە نەمابوو ، بە پێی پەتی بە کۆچەو بازاڕەکانی شاری (ئەسینا)دا دەسووڕایەوە ، لە تەمەنی (٤٠) ساڵیدا کچێکی (١٧) ساڵی شووی پی‌کرد ، لەگەڵ ئەوەشدا یەزدانی بەرز ، زیرەکی‌یەکی تەواوو دەروونێکی بەهێزو تیبینی‌یەکی ووردوو بیرکردنەوەیەکی قوڵی دابووپێی ، لەگەڵ ئەوەشدا ، خۆی هەر بەکەم دادەناو ، دەی‌ووت : من دانانیم ، بەڵام دانایم خۆش دەوێت .

ئەم زانایە بە دامەزرێنەری (فەلسەفە)ی یۆنانی دادەنرێت ، و ڕێگەی تایبەتی هەبوو ، لە گفتوگۆ وووتوو ویژکردندا ، کە پێی دەووترا ، ڕێگەی ( دایلاکتیك)(٣٠) ئەم ڕێگەیەش ، بریتی بوو لەوەی کە ئەو پرسیارانەی لە بەرامبەرەکەی دەکرد ، کە بە (بەڵێ)و (نەخێر)

---

(٣٠) مبادىء التربية - تاليف الدكتورين خالد الهاشمي ، واحمد حسن الرحيم ط٢ مطبعة وزارة المعارف في بغداد ١٩٦٢ ص٦٢

وەلام بدرێتەوە ، بەم شێوەیە بەردەوام دەبوو لە سەر پرسیارکردن‌و لە سەر یەك پرسیاری دەکرد ، تا وەکو بەرامبەرەکەی کاتێکی دەزانی دەچووە سەر ڕاکەی‌و دەکەوتە داوێوە ، بۆ ئەوەی پێ بزانێت .

سوکرات[31] تا بەم ڕێگەیە توانی (سۆفستائی) یەکان بەزێنێت ، کە بیرو باوەڕی پڕو پووچیان ، لە ئەسینادا بلاو دەکردەوە .

تا بەم شێوەیە سوکرات ، هێواش هێواش توانیویەتی بەرامبەرەکانی خۆی لە کاتی ووت وویژ کردندا ، بێنێتە سەر ڕاکانی ، بە بێ ئەوەی هەستیان زامداربکات .

پێش (٥) هەزار ساڵ لەمەو پێش یەکێك لە دانیشتوانی وولاتی ( چین ) وتوویەتی :ـ ئەوەی هێواش بڕوات (١٠٠) ساڵ دەڕوات .

١٦ ـ خوێندنەوە : تا بێت دەکرێت ، بەرتووك‌و گۆڤاری بە نرخ بخوێنەرەوە تا بێت دەگرێت بە شوێنی بەرتووك‌و گۆڤاری بە نرخدا بگەری و هاتوو چۆی (کتێبخانە)کان بکە ، چونکە خوێندنەوەی نوسراوو چاپەمەنی یە بەنرخەکان ، ئاگاداری ئەو گۆڕانانەت دەکەن ، کە بەسەر کاروباری ڕوشنبیری‌و ویژەیی‌و زانستی‌و باری ڕامیاری‌و کۆمەلایەتی‌و ئابوریدا ، دێت ، نایەلێت لە کاروانی پێشکەوتن ، بەدوا بکەویت ، ئەگینا دووای چەند ساڵێك خۆت لە کۆمەلداو لە کۆری هاوریاتا ، بە بێانە دادەنێت‌و نامۆیی دەکەیت ، نازانیت دوو وتوو ویژی ڕۆشنبیریانەیان لەگەلدا بکەیت .

بە پێویستی نازانم کە ئەوەت بۆ بلێم زۆر گرنگە کە بکەرێت بە

---

(٣١) افلاطون ـ تاليف عبدالرحمن بدوی ط٤ ـ مكتبة النهضة المصرية ١٩٦٤ في القاهرة .

دووای ئەو چاپەمەنی یانەدا ، کە باسی (پیشە)کەت و ڕێگەو شێوەی پێشکەوتنی دەکەن بەتایبەتی ئەو چاپەمەنی یانەی کە باسی تازەترین و بەرەپێداوترین ڕێگەی دەکەن .

١٧ ـ هاتوچۆی یانەکان : ناڵێم هاتووچۆی ( یانە ـ نادی ) یەکسان بکە ، لەوانەشە بڵێت : ئەم مامۆستایە وا دیارە مرۆڤێکی ووشك و دواکەوتووە ، هەر جێ دەڵێت ، گەردنت ئازاد بێت ، چونکە (یانە) لە وولاتاندا جێگەی چەندەها گورج و گۆڵی و چالاکیی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و ڕۆشنیری و وەرزشی یە وەباشترین هۆیە بۆ پەرەپێدانی کەسێتی مرۆڤ ، بەڵام ( یانە ) لە وولاتی ئێمەدا ، تەنها جێگەی خواردن و خواردنەوەو مەی نۆشینە ، هێشتا زۆر کەس هەن ئەوەشی پێ ڕەوا نابینن و بە شیاوی ئەوەشی نازانن ، لەبەر ئەوە لەماڵەوە دەخونەوەو هاتووچۆی ناکەن ، هەرچەند پارەی هاتوو چۆکەشی بەزۆر هەر لێ دەسەندن .

تۆ بڵێت لەبەر چی بێت ؟

بە ڕای من لەبەر ئەم هۆیانەیە :ـ

١ـ١٧ـ یانەکانمان لە ئامانجە بناغەیی یەکانی (یانە)ی ڕاستی بە جۆرێك لایان داوە ، ئامانجەکانیان کۆ کردۆتەوە ، ودایان ماڵیوە ، هێنا ویانە تە سەر یەك ئامانج ، ئەویش ئامانجی ئابوری و دراو قازانج کردنە، ئیتر ئەمە خەتای کێ بێت ، ئەوە خۆی دیارە ، یان کاتێك دەستەی بەرێوەبەر دەخرێتە هەڵبژاردنەوە ، ئەو مەبەستانەی زیاتر دەخرێتە بەرچاوو ، ئاشکرا دەکرێت .

٢ـ١٧ـ بەڵێ ڕاستە لە بەیرەوی ناوخۆیی زۆرترین (یانە)کاندا ، باسی کتێبخانەو خوێندنەوەو خواستنەوەو بەرتووکیش کراوە ، لە مە

زیاتریش باسی لیژنەی ڕۆشنبیری و وەرزشی و هاتووچۆی هاوینەهەوارەکان و زستانەهەوار ( لجنة السفرات )یش و چەند لیژنەیەکی دیکەیش کراوە بەڵکو ناوی سەرۆك لیژنەکان و ئەندامەکانیشیان ، ناو نراوە ، لە تۆ مارگەی تایبەتیدا دیاری کراوون بەڵام ئەمانە لە کاتی جێبەجێ کردندا هەموویان پشت گوێ دەخرێن ،
هۆی ئەم پشتگوێ خستنەش ، ئەوەیە کە ئەو کەسانەی کە بۆ سەرپەرشتی یانەکان ، هەڵدەبژێررێن لەوانەیە ئەو ئارەزووانەیان تێدا نەبێت ، بەڵکو بەپێی چەند مەرجێکی دیکەن.ئەمجا ڕاست وایە ، هەموو (یانە)یەك ،کتێبخانەیەکی خنجیلانەی پڕ لە پەرتووکی تازەو هەمەجۆرەی تێدا هەبێت ، لەگەڵ سالۆنێکی ڕێك و پێکی ئامادە کراوو ڕازاوە ، بۆ خوێندنەوە ، لە ژێر چاودێری لیژنەیەکی چالاکدا ، و بە شداری هەموو جۆرە ڕۆژنامەو گۆڤارێکی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بە نرخ بکات ، هەموو مەرجێکی (یانە)ی هاوچەرخی ، تێدا هەبێت .

ئەم جۆرە یانانەیە ، کە دەتوانن خزمەتی ڕاگوزەران و هاتووچۆکەران و بە شداران بکەن و کەسێتی یان بەهێز بکەی ، چونکە ئەو کاتە لەگەڵ بیرو باوەڕی هاتوو چۆکەراندا ، دەگونجێن .

## خوێنەری بەڕێز

دوای ئەوەی (۱۷) ئامۆژگاریمان پێشکەش کردن ، بۆ ئەوەی کە سەرکەوتووبن لە ژیانتانا ، گرنگترین نیشانەی مرۆڤی سەرکەوتووتان بۆ تۆمار دەکەین ، ئەو نیشانانەی کە لە کۆمەڵی کوردیدا پەسندن و پێویستە لە خۆتانا بیانڕسکێنن و پەرەیان پێ بدەن

گورج و گۆڵی ، زمان ڕەوانی ، قسەخۆشی ، تێکەڵاوی ، وریایی ،

به پشوویی ، خوێندنەوەی زۆر ، ئارەزومەندی ، بەخشندەیی ، دەست پاکی ، شەرەفمەندی ، ئازایەتی ، بەزاتی ، دلسۆزی ، وەفاداری ، ڕاست بێژی ، مرۆڤی سەرکەوتو توانای هەیە لەنگەری دەروونی خۆی ڕاگرێت ، مرۆڤی سەرکەوتوو ئامانجەکانی ئەوەندە بلند نی‌یە ، کە نەتوانێت پێیان گاتێ ، واتە : ( بەرز نافڕێتو نزم نانیشێت ) ، کەسێتی سەرکەوتو خۆی ڕادەهێنێت لە سەر سەرکەوتنو زالبوون بە سەر گیرو گرفتەکانی ژیاندا ، هەمیشە بە شوێن ئەو هۆو کارکەرانەدا دەگەرێت ، کە دەبنە پالپشتی سەرکەوتنی لە ژیاندا .

کەسێتی سەرکەوتو هەمیشە هەولی ئەوە دەدات کە خۆی دوور بگرێت لەو سیفاتانەی کە لەگەل نیشانە باشەکانی کەسێتیدا دژنو کۆ نابنەوەو ناگونجین وەکو : یەکێك یان زیاتر لەم نیشانانە : مەی‌نۆشی ، سەرخۆشی ، جگەرە کێشان ، قومارکردن ، قوماربازی ، فێلبازی ، دەستبڕینو دەست شکاندن دەستپیسی ، ناپاکی ، شەوالبلێتی ، گزی کردن ، لەگەل ئەمانەشدا چەند نیشانەیەك هەن ، دژی گەشەکردنی کەسێتین بەلام لە دەستی مرۆڤ خۆیدا نین وەکو : دەم گۆنەکردن ، زمان تەتەلە کردن .

# گرنگترین ئەو گیروگرفتانەی کە کەسێتی مرۆڤ دوادەخەن

ئەو گیروگرفتانەی کەسێتی مرۆڤ دووا دەخەن‌و ، ڕەووشـــتی لێڵ‌و تاریك دەکەن ، ئەمانەن :ـ

## ١ ـ ڕەشبینی

ڕەشـین : جۆرە هەلوێستێکە(٣٢) ، بەرامبەر ژیان ، یان فەلسەفەی ژیان ، کە بەم شێوانە دەر دەبڕێت :ـ

١ـ١ـ ئەو کەسە لـــە خەیاڵی خوێدا دەڵێت : باش وابوو مرۆڤ نەبووایە نەبوونی ، لە بوونی باشترە ، بەڵـکو خۆزگا یەژیان هـــەر نەبوایـــە •

٢ـ١ـ مرۆڤ بۆ داماوی‌و سزا کێشان لە دایك دەبێت •

٣ـ١ـ ئەم بیردۆزە پەیوەندیی هـــەیە ، بە فەلسەفەی زانایەکی ئەڵمانی‌یەوە ، کـە ناوی ( شوبنهاوەرە ) •

ئەم فەلسفەزانە یان ئەم فەیلەسوفە ژیانی بە خراپ داناوەو دەڵێت :

ئازارو سزا کێشان ، یاسایەکن ، بۆ ژیان ، زیان دەچێنن • ئـــەو

(٣٢) أسعد رزوقي ـ موسوعة علم النفس ـ ص٧٤ •

کەسانەی ڕەشبین ، هەمیشە هاوارو سکاڵا لە بێبەختیو چارەڕەشی خۆیان دەکەن ، دەڵێن ئەوەندە چارەڕەشین ( بچینە سەر سیروان ووشکی دەکەین ) .

ئەگەر بێتو لە بارەی دەروونییەوە لە مرۆڤی ڕەشبین بکۆڵینەوە ، دەبینین : کە خۆیان ئارەزووی سەرنەکەوتنو لەکیسچوون دەکەن ، خۆیان حەز بە هەناسەساردی و ڕەنج پێوەری دەکەن ، خۆیان تینوون بۆ خزانو کەوتن . بە لاتەوە سەیر نەبێتو سەرتسوڕ نەمێنێت، چونکە سیگموند فروید ، ئەمانەی تاقی کردوتەوەو هەڵیسەنگاندوونو لەم بارەیەو دەڵێت : ئەو جۆرە کەسانەی کە (ئالەر)ی مردنیان بەهێزترە ، بە چەند ڕێگەیەك ، دەری دەبڕن یەکێك لەو ڕێگایانە ( خۆکوشتە ، یەکێکی دیکەیان حەز بە ( ڕەنجپێوەری ) و هەناسەساردییە .

چونکە دڵنیان لەوەی کە سەرکەوتن و قانزاج کردن دەیان بەستێت بە زیانەوەو چەلوملی دەبن ، ئەگەر زیان نەکەن .

نموونەیەکی دیکە بۆ حەز بە ڕەنجپێوەریکردن ، ئەوەیە کە هەندە مێردێك هەن ، لەبەر ئەوەی حەز لە ژنەکانیان ناکەنو هیچ خۆشەویستییەك لە نێوانیاندا نییە ، حەز بەسەرکەوتن ناکەن ، بەڵکو حەز بەهەناسەساردی و ڕەنج پێوەری و لە کیس چوون دەکەن ، چونکە دەزانن سەرکەوتنو قانزاج کردنەکانیان ، دەبێتە هۆی خۆش گوزەرانیو بەختیاری هاوسەرەکانیان . لەم واتەیەدا ، پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت کەری دێز حەز لە تۆپینی خۆیو زیانی خاوەنەکەی دەکات .

زۆر کەس هەن لەم بابەتە کە گورجو گۆڵییەکانیان ، یان

پێشەکانیان نابەنە سەر بە بەڵگەی ئەوەی قورسن ، یان مەترسیان تێدا هەیە .

فرۆید دەڵێت : ئەمە بۆ ئەوەی کە سەرنەکەوێتو نەگاتە ئامانجەکانی . هەرچی جۆنێك هەبێت ڕەشبینی کەسێتی مرۆڤ دووا دەخات ، پێویستە مرۆڤ سەرکەوێت بەسەریداو خۆی ڕوون بین بکات ، بە چاوێکي کراوەی پڕ لە خۆشیو کامەرانی‌یەوە تەماشای ژیان بکات .

## ٢ ـ تەگەرەی دووەم

لە ڕێگەی دروست بوونی کەسێتی‌یەکی سەرکەوتوو تەگەرەیە فێربوونی هەندە ڕەووشتو خوویەکی ناشیرین ، وەکو : مەی‌نۆشی کات کوشتن بە هاتو چۆی چایخانە و یاریگەو دومینەو قومارەوە .

زاناکان دەڵێن : ئەو قومارچیانەی کە واز لە قومار ناهێنن‌و لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەی‌دۆڕێنن‌و ئەش‌زانن ، دەی دورێنن کاتێك هیچ تەمێك وەرناگرن ئەوانە ئارەزوویەکی بێ‌هەستی‌یان هەیە کە بیدۆڕێنن ، ئەگینا بۆچی واز ناهێنن ؟!

## ٣ ـ تەگەرەی سێیەم جگەرەکێشانە

کارێکی ئاشکراو ڕوونەکە جگەرەکێشان لە کەسێتی مرۆڤ کەم دەکاتەوەو دەبێتە تەگەرە لە ریگەی پەرەسندنیا ، چونکە دەرکەوتووە ، کە جگەرە کێشان چالاکی کەم دەکاتەوە ، مرۆڤی جگەرەکێش ماوەی نوستی کەمەو ، دەمو دانی زۆوزوو پیس دەبێتو دانەکانی ڕەنگی تێك دەچێتو تامی دەمی ناخۆش دەبێت ، بەلغەمی زۆر دەبێتو دەکۆکێتو باوەڕی بە خۆی نامێنێت ، باری دەروونی بێ‌لەنگەرو دەبێتو زووزوو توڕە دەبێت .

بێجگە لەوانەش جگەرەکێشان زیانی تریشی هەیە ، بە تاقی کردنەوە دەرکەوتووە کـە ژمارەی نەخوشەکانی شێرپەنجەو ، سیل‌و نەخۆشەکانی دڵ‌و کۆ ئەندامەکانی سوڕیخوێن‌و نەخۆشەکانی زامی گـەدە ، لـە جگەرەکێشـەکاندا زۆرترن ، وەك لە جگەرە نەکێشەکاندا .

ئەمـە بێجگە لەو زیانە ئابووریەی کـە لە جگەرەکێشن دەکەوێت ، لێرەدا پرسیارێکت لێ دەکەین ، دەڵێین : بۆچی جگەرە دەکێشیت ؟ ئایە لە بەر ئەوەیە کـە خۆت بنوێنیت ؟ یان لەبەر ئەوەیە چاو لە کـەسێك ، یان باوکت ، یان کاکت ، یان ماموستاکەت دەکەیت ؟ یان بۆ ئەوەیە کـە خەڵـکی بە گەورەت بزانن ؟ یان کاتی پێدەکوژیت ؟ یان هەست بـە دڵەراوکێ دەکەیت‌و وا دەزانیت جگەرە چارەسەرێکی باشە ؟

## ٤ ـ یەکێکی دیکە لەو گیروگرفتانە

ترسنۆکی‌و شەرمنی‌یە ، کە هەردووکیان دەبنە پێشـکەرێك ، بۆ تێکەڵاوی نەکردن‌و دوورە پەرێز گرتن ، لـە ناو کۆمـەڵدا ، ئەمـانیش سێبەری نەخۆشی‌یەکی ناتولایە کە ( هەست بە کەمسەری )یە ، چونـکە مرۆڤی ترسنۆك‌و مرۆڤی شـەرمن ، دەترسن لە تێکەڵاوی کردن‌و ڕوو بەڕوو بوونەوەی کەسانی دیـکە ، خەڵـکیش باوەڕیان پێ ناکـەن ، بەجـۆرە مرۆڤێکی ساردوو سڕیان دادەنێن ، یان بە تێـك‌قورس‌و چارەگرانیان دادەنێن ، پێویستە جیاوازی بـکەین لە نێوان شەرمنیـەکدا ، کـە دەگاتە ڕێزی ترسنۆکی ، ژیان لە کەسێتی مرۆڤ دەدات ، لەگەڵ شەرم‌و ئابڕویەکدا کە پڕە لەڕێز گرتن‌و نرخزانینی،گەورەتر لە خۆ زاناتر لە خۆو دوور لە هەست بە (کەمسەری) ، هەست خۆ بە کەم زانین چونکە شەرم‌و شکۆ کە لە ڕادەی خۆی دەرنەچوو کارێـکی کۆمەڵایەتی‌یە

له ڕیزی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە ، گشە بە کەسێتی مرۆڤ دەدات .

کۆمەڵ ئافرەتێکی ڕێك‌و پێکی سەربەستی بە ناموسی بە لاوە پەسندو بەڕێزە ، بەڵام ئافرەتی زۆر شەرمنی لاوازی ، یان ئافرەتی بەرەڵلای بێ ئابڕووی ، بەلاوە پەسند نییە .

هەر وەکو چۆن کۆمەڵ لاوێکی سەربەستی بە جەرگی ڕێك‌وپێکی بە لاوە پەسندە بەڵام لاوێکی شەرمنی ترسنۆکی پاڕای بە لاوە پەسند نییە .

## ٥ ـ زۆر خواردن

لە کەسێتی مرۆڤ کەم دەکاتەوە .

## ٦ ـ کات بە فیڕۆدان

وخۆخەریك کردن بە خوێندنەوەی گۆڤارو بەرتووکی پڕوپوچەوە .

## ٧ ـ شەڕ نانەوە

فتووری‌و گیرەشوێنی‌و قرەقری زۆر لە کۆڵان‌و بازاڕو لەگەڵ دەرودراوسێدا .

# چۆن کەسێتی مرۆڤ دەناسینەوە ؟

بەڕاستی دۆزینەوەی کەسێتی مرۆڤ ، کارێکی سووکو ئاسان نی‌یە ، چونکە مرۆڤ زیرەکترین گیانداری سەر ڕووی زەمینە ، بە گاڵتە یەزدانی گەورە مرۆڤی بە جێگری خۆی دانەناوە لە سەر ڕووی زەمین ، ئەگەر زیرەکوو ووریاو خۆ گۆڕ نەبوایە ، تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی مرۆڤ ، وەکو : تاقیکردنەوەی گیانداروو ئاژەڵ نی‌یە ، لەبەر ئەوەی کردەوە کردن لەگەڵ بێ گیانداو تاقیکردنەوەی بە هەر جۆرێك بێت‌و بۆ هەر مەبەستێك بێت ، کارێکی سووکو ئاسانە هەروەهاش کردەوەکردن لەگەڵ ڕووەکو گیانەوەردا ، بە گوێرەی ئەو هەوڵەی کە لەگەڵ مرۆڤدا دەدرێت ، بۆ مەبەستێك . و لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ لە ناو خۆیاندا جیاوازن و هەریەکە جۆرە سیفەتێکیان هەیەو لەبەر ئەوەش کە مرۆڤ بە شێوەیەکی ڕاستەو خۆ بە گران دەخرێتە ژێر تاقیکردنەوە ، و لێکولینەوەو بەڵکو زۆر کەڕەت ، پێویستە بە شێوەیەکی ناڕاستەو خۆ لێی بکۆڵرێتەوە .

ئەمجا لەبەر ئەوە زیاتر لە دووهەزار ڕێگە بۆ دۆزینەوەو ناسینەوەی کەسێتی مرۆڤ داهێنراوە ، لەبەر ئەوەی لێرەدا ناتوانین هەموو ڕێگاکان باس بکەین ، چەند ڕێگەیەکیان باس دەکەین : دەبێت ئەوەش بزانین،

ئەم ڕێگایانەش هەمە جۆرەن ، واتە تێکەڵ وپێکەڵن ، لە ڕێگەی کۆنو ڕێگەی نوێ پێکهاتوون ڕێگەی وایان هەیە کە بنچینەیەکی زانستیی داڕێژراوی هەیە و بە باشیش پشتی پێدەبەسترێت ، ڕێگەی واشیان هەیە پشتی پێ نابەسترێت ؛ ئەی باشە بۆچی باسی دەکەین ؟ لەبەر ئەوە باسی دەکەین چونکو جۆرە کەڵکێکی لێ وەردەگیرێت ، وناسینیشیان هەر باشترە ، وەك لەوەی نەزانرێن :

## ١ ـ ڕێگەسەرناسی :

ئەم ڕێگەیە لە زۆر کۆنەوە ، تا وەکو ئێستە ، ناوبانگی هەیەو باس دەکرێت .

ئەو کەسانەی ئەم ڕێگەیەیان بەکار هێناوە ، هاتوون لەشی مرۆڤیان بە چەند بەشێکەوە کردووە ، هەر بەشێکیان بە چەند بەشێکی بچوکترەوە کردووە .

بۆ نموونە سەری مرۆڤیان بە چەند هەرێمێکی جوگرافیی‌یەوە کردووە ، بۆ هەر هەرێمێك چەند نیشانەو سیفەتێکی تایبەتی‌یان داناوە، ئەگەر ئەو هەرێمە ( شوێن ) لە کەسێکدا ئاشکراترو دیارتر بوایە ، ئەوە بەڵگە بووە لە سەر ئەوەی کە ئەو کەسە جۆرە کەسێتی‌یەکی تایبەتی هەبووە ، و بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەو شوێنە نەمك بووایە ، یان چاڵ بووایە .

هەندێك لە سەر ناسەکان کەسێتی مرۆڤیان بە شێوەی چاوی یان ڕەنگی چاوی ، یان ڕەنگی پێستی ، یان زلی ، یان بچووکی ئەندامێك لە ئەندامەکانی لەشی ، یان چاڵی ، یان دەربۆقیوی ، شوێنێك لە لەشی ، مرۆڤیان سەرناس کردۆتەوە ، هەروەها بە لووت ، بە دەم ، بە گوێ ، بە

تەختی ناوچەوان ، بە شێوەی دەموچاو ، جۆری کەسێتی مرۆڤیان سەرناس کردۆتەوە ، یان ناسیوەتەوە • زۆر لە سەرناسەکان ، ڕوانیویانەتە ناو لەپو هێلەکانی ناو لەپیان بە پێی کورتو درێژی خوێندۆتەوەو کەسێتی ئەو کەسەیان دیاری کردووەو ناسیویانەتەوە ، بەڵکو هەندێك لە مرۆڤە سەرناسەکان لەوە دوورتر ڕۆیشتوون ، هاتوون بە شێوەی نوسینو دەستخەت ، جۆری کەسێتییان دۆزیوەتەوەو باری دەروونی مرۆڤیان دەست نیشان کردووە •

بە ڕاستی لە منداڵیمدا ، هەموو جارێك سەرسام دەبووم کە (ئەلی) دێوانەیەك هەبوو ، هەر منداڵێك پشتی ملی چال بوایە ، کە قسەی دەکرد، دەیووت ئەمە درۆزنە ، سوێنەگورگانەی بدەن ، یان ئەو منداڵەی سەری زل بوایە دەیووت : نانو دۆبرە •

لە ڕاستیدا ئەم سەرناسە ڕێگەیە ، یان ڕیگەی سەرناسی ، لەبەر ئەوەی لە سەر بنچینەیەکی زانستی دانەرێژراوە ، بڕوای پێ ناکرێتو ئەنجامەکانی ناسەلمێنرێت •

## ٢ ـ شێوەی لەشو لار

ئەم ڕێگەیە زانایەکی ئەڵمانی بە ناوی ( کریتشمار ) دایناوە ، لە باسی جۆرەکانی کەسێتیدا باسمان کرد •

## ٣ ـ گەجەریو[٣٣] هەست بە کەمسەری

گومان نی یە لەوەدا کە پەیوەندی هەیە لە نێوان گەجەریو ڕەووشتەکانی مرۆڤی گەجەردا ، ئەم پەیوەندی یەش ، وەنەبێت تازە

---

(٣٣) مجلة العربي ـ العدد ٨٩ ـ ١٩٦٦ ص٥١ •

دۆزرایێتەوە،بەڵکو هەر لە چەرخەکانی دێرینەوە هەست بەم پەیوەندی‌یە کراوە ، چونکە ( دیموستین ) کە کابرایەکی ئەگریکی بووە ، باشترین بەلگەیە ، بۆ ئەوەی کە هەست بە کەمەری ، چۆن باڵی پێوە ناوە ، بۆ ئەوەی بریتی بکاتەوە ، دەڵێن : ئەم کابرایە زوبانی (تور) بووە ، هەموو کەرەتێك چووە تەسەر لێواری دەریایەك ، بردەمی لە چەوی خڕ کردووە دووای ئەوە هەر لە خۆیەوە ووتاری بۆ شەپۆل داوە ، تاوای لێهاتووە سەرکەوتووە بە سەر ناتەواو یکەیداو (تور)ی یەکەی بە سەر چووەو لە وولاتی ئەگریکدا ، باشترین ووتار خوێنی لێ دەرچووە ٠

مێژوو دەڵێت : ( تەیموری لەنگ )یش بەلگەیە لە سەر ئەوەی کە پەیوەندی هەیە لە نێوان گەجەری‌و ڕەووشتی مرۆڤدا ، چونکە ئەم کەسێتی‌یە یەکێکە لەو کەسێتی‌یە مێژوویانەی کە دەستەلاتیان بە سەر بەشێکی زۆری زەمیندا گرتووەو ڕووی مێژویان گۆڕیوە ٠

دکتور ( ل ـ ب ـ بج ) باسی[٣٤] ژمارەیەکی زۆری لە مرۆڤە مێژووی‌یەکان کردووە کە نزیکبونەتەوە لەوەی بنە قوربانی‌و کوزراوی دەستی ناتەواوی گەجەری ، ئەندامەکانی لەشیان ، بەلام بە بڕیاری بەهێزیان‌و بە پشووی درێژیان ، توانیو یانە سەرکەوون‌و چەند کەسێتی‌یەکی بەناوبانگ بۆ خویان دروست کەن ٠ ئەو کەسانەش‌و وەکوو ئەسکەندەری گەورە ، قەیسەری ڕۆم ، ناپلیۆن بۆنابرت و چەند کەسێکی دیکە ٠

---

(٣٤) ـ تكوين الشخصية ـ تاليف الدكتور نوري الحافظ ـ ط١ ١٩٦١ مطبعة المعارف في بغداد ص١٢٢ ٠

ئەمانە هەموویان[٣٥] بەلگەن لە سەر بوونی پەیوەندی لـــە نێوان گەجەری‌و ڕەوشتی مرۆڤدا ، و بەلگەشن لە سەر ئەوەی کـــە مرۆڤی گەجەر دەتوانێت باشترین (بری) بکاتەوە ، هەرچەند هەشیانە کـــە دەبنە داماوی دەستی شەلی یان کوێری یان هەر ناتەواوی‌یەکی لەشی یان هەبێت ، و تا مردن بە کەساسی‌و زەلیلی دەژین‌و ناتوانن (بری) بکەنەوە .
هەرچی چۆنێك هەبێت ئەم ڕێگەیە بە ڕێگەیەکی دۆزینەوەی جـــۆری کەسێتی دانراوە .

## ٤ ــ ڕێگەی شێلدون :

ولیم شیلدون[٣٦] دەڵێت : دەتوانین کەسێتی مرۆڤ لـــە ڕێـــگەی دابەش کردنی لەشی‌یەوە ، بناسینەوە .

ئەم زانایە لەشی مرۆڤی کردوو بە سێ بەشەوە ، یان بەسێ چینەوە، دەرەچین ، ناوەندەچین ، ناوەچین :

مەبەست بە (دەرەچین) چینی دەرەوەی لەشی مرۆڤە کە بریتی‌یە لە پیست‌و کۆ ئەندامی دەمار ، ئەو کەسانەی بەم ڕووە بدۆزرێتەوە ، پێیـــان دەووترێت ( دیارە کەسێتی ) .

مەبەستیشی بە (ناوەندەچین) ئێسك‌و ماسولکەکانە ، ئەو کەســانەی بەم ڕێجکەیە ، بدۆزرێنەوە ، پێیان دەووترێت ( کەسێتی بەخۆوە ) یان ( کەسێتی ماسولکەدار ) ، بە هەردووکیان دەووترێت : (لەشەکەسێتی) .

---

(٣٥) الشعور بمركب النقص ــ تاليف ــ دبليو ــ جي ــ مكبرايد ترجمه الى اللغة العربية ــ كاظم سلمان البدوى ط١ ١٩٦٦ في بغـــداد ص٥٠

(٣٦) ــ المدخل الى علم النفس الحديث ــ تاليف ريكس نايت ومركريت نايت تعريب : د ــ عبد علي الجسماني ط٣ ١٩٨٤ بغداد ص٢٨٨

الشعور بمركب النقص

مەبەستیش بە (ناوەچین) سكو سنگە ، ئەو کەسانەی بەم رێگۆکەیان بەم پێنجکەیە ، کەسێتی‌یەکانیان دەدۆزرێتەوە ، پێیان دەووترێت ( کـەسێتی هـــەناوی ) •

(دیارەکەسێتی) جێی دەرەوەی لەشی دیارو ئاشکراترە ، میزاژیشی توورەیەو گۆشەگرو دوورەگرەو لەشیشی زۆر هەستیارە ناویشی نـــاوە ( کەسێتی دەماخە میزاژ - Cerebrotonia )

( لەشەکەسێتی ) تێـكو ماسوولکەکـــانی دیارترو ئاشکراترن میزاژیشیان حەز بە دەست بەسەرا گرتنو دەست درێژی ، و بزێوی‌و چالاکی‌و بەربەرە کانی کردن دەکەن •

( کەسێتی هەناوی )ش سنگی پانو پۆڕو سکە ( وورگنە ) ، ئەمانە زۆر خۆرو سکەرۆنو حەز بـــە خواردنو خواردنەو ، و حەوانەوەو بەڕابواردنو سك لەوەڕاندن دەکەن ، لە لایەکی دیـکەشەوە حـەز بە تێکەڵاوی‌و پەیوەندیش دەکەن •

بۆ سەلماندنی بیردۆزەکەی شێڵدون هاتووە ، وێنەی (٤) هـــەزار قوتابی کوڕی ، بـــە ڕووتی ، لە هەموو لایەکەوە ، لە پێشەوە ، لـــە تەنیشـتەوە ، لە پشتەوە ، گرتووە ، ئەمجـــا هـــەموو وێنەکانی بەڕیز ڕێكخستوون ، بۆ ئـــەوەی چـەند تەرزێـکی دیکەی لە مرۆڤ بۆ دەرکەوێت ، بەڵام لەو سێ تـــەرزە زیاتری بۆ دەرنەکەوتووەو دیاری نەکراوە ، بە شێوەیەکی ئاشکرا •

ناتەواوی[٣٧] بیردۆزەکەی شێڵدون ، لەوەدا دەردەکەوێت کە لە

---

(٣٧) المدخل الى علم النفس الحديث ـ تاليف ركس نايت ومركريت نايت ترجمه الى اللغة العربية الدكتور عبد علي الجسماني ط٣ ١٩٨٤ في بغداد ص٢٢٨ •

بەر باغەیەکی زانستی دانەڕێژراوە ، چونکە لە سەر ڕێڕەوی کریتشماری زانا ، ڕۆیشتووە ، لە پێڕۆکەیدا (سیستەم) • جێگەی مرۆڤ لە سەر پلیکانەیەکی حەوت پلەیی دیاری کراوە ، لەگەڵ ئەوەشدا چەند ئەنجامێکی زۆر کەم هەر دەدات بە دەستەوە •

## ٥ ـ ڕێگە ڕژێنەکان : *rège nyên*

جانسخ دەڵێت : بۆمان هەیە کە لە ڕێگەی ڕژێنەکانی ناو لەشەوە ، جۆری کەسێتی مرۆڤ بدۆزینەوە چونکە ڕادەی کەمو زۆری ئەو شیلانەی کە ڕژێنەکانی نێو لەش دەری دەدەن ، بێگومان کار دەکاتە سەر ڕەووشتو جۆری دروست بوونی کەسێتی مرۆڤ •

ئەم زانایە بە پێی ئەمە کەسێتی کردووە بە دوو بەشەوە :

یەکەم : کەسێتی ( ب ـ B ) : ئەو کەسەیە کە گلاندی سایرۆید لە لەشیدا دەناوسێتو شیلەی زۆر دەرژێنێتە نێو لەشەوە •

دووەم : کەسێتی ( ت ـ t ) : ئەو کەسەیە کە گلاندی سایرۆید شیلەی کەم دەرژێنێتە ناو لەشی یەوە •

پێویستە ئەوەش بزانین کە ( گلاندی توخمی )یش ، دووبارە کار دەکاتە سەر ڕەووشتو ، سۆزو ، دەست درێژی و ، فێربوونو ، بیرهاتنەوە •• هتد ••••

تا ئێستەش دەروون زانەکان بە بێ ووچان زۆر بەگەرمی لەم بابەتانە دەکۆڵنەوە •

## ٦ ـ ریگە شیتەلی‌یەکان

لە کاتێکدا[٣٨] ناوی ئەم ڕێگەیە دەبرێت زانای بەناوبانگ (سیگومەند فرۆید )مان یاد دەکەوێتەوە ، چونکە ئەو بە یەکەم دامەزرێنەری ئەم ڕێگایە دادەنرێت •

فرۆید دەڵێت : کەسێتی مرۆڤمان بە یەکێك ، یان زیاتر ، لەم ڕێگایانە بۆ دەردەکەوێت

١ـ٦ـ ڕێگەی خەون لێکدانەوە •

٢ـ٦ـ ڕێگەی خەواندنی موگناتیسی ئەم ڕێگەیە بریتی‌یە لە جۆرە بێ هۆش کردنێك ، بە ڕێگەی ( الایحاء ) •

٣ـ٦ـ ڕێگەی خەواندنی سڕی : ئەم ڕێگەیە بریتی‌یە لەوەی ئەو کەسەی کە بمانەوێت ، جۆری کەسێتی‌یەکەی بدۆزینەوە ، بەنجی دەکەین ، بەهۆی دەرزی سڕکردنەوە ، هەر وەکو چۆن لە نەخوشخانەکاندا ، بۆ کاری نەشتەرگەری بەکاری دەهێنن •

ئەوجا کە ئەو کەسە سڕکرا ، دیوی بێ هەستی ژیری دەکەوێتە قسەو وڕێنە کردن ، بێ ئەوەی کە هیچ نهێنی‌یەکی خۆی بشارێتەوە •

٤ـ٦ـ ڕێگەی یادکردنەوەی ئازاد واتا مرۆڤ بە شێوەیەکی سەربەستو ئازادو بەرەڵایی بیر دەکاتەوەو جۆرە کاروکارەساتێکی یاد دەکەوێتەوە ، لە کاتی پەلەپەلو شەڵە ژاندندا ، نایەتەوە بیری •

٥ـ٦ـ ڕێگەی زوبان هەڵخزاند : ئەگەر لە فرۆیدمان بپرسیایە، بۆچی بەم ڕێگایانە جۆری کەسێتی مرۆڤ دەدۆزێتەوە ؟ لە وەڵامدا

---

(٣٨) اصول علم النفس ـ تالیف الدکتور احمد عزت راجع ص١٢١

دەی ووت : چونــکە کەسێتی مرۆڤ لە دوو پاڵنەری سەرەکی پێکهاتووە. یەکەمیان : پاڵنەری ژیان (توخم)ە کـــە پێشی دەووترێت ( ئایروس ـ Eros ) دووەمیان پاڵنەری مردن (وێران کردن )ە کە پێشی دەووترێت ( ســاناتوس ـ thanatos ) ، دەڵێت ڕەگوو ریشەی ئـــەم دوو پاڵنەرە دەچێتەوە ســەر ووزەیەکی ( پڕتەو ـ حیوی )ی گشتی بەهێــز کە ناوی (لەبیدۆ)یە ، ووزەی زایەندییەتی •

فرۆید دەڵێت : ئامــانجی پاڵنەری توخمی ، تەنها منداڵ خستنەوە نییە چونکە مرۆڤ تا تەمەنی نەگاتە قوناغی هەرزەکاری ناتوانێت زاوزێ بــکات لەگەل ئەوەشدا ، پاڵنەری توخمی هەر لە کاتی لەدایك بوونەوە ، تا وەکو مردن هەیەو کار دەکاتە سەر ڕەووشتی مرۆڤ ، بەڵـگەش بۆ ئەمە ئەوەیە ، کە منداڵ لە مەمك مژین ، و مەمکەمژین ، و پەنجەمژینو، گازگرتنو ڕاکردن و بازدانو یاریکردن لـــە زەتێــکی توخمی وەردەگرێت •

هەرچـــەند ئەدلەرو کۆمەڵێك زانای دیـکە ، هەستاوونو دژی فروید وەستاوونو بەرهــەڵستیان کردووە ، بەڵام ڕاکانی فرۆید ، تـــا ئێستەش هەر دەنگ دەداتەوەو وەکو گەنجینەکەی قـاروون گوێمـــان دەزرنگێنێتەوە. فرۆید دەڵێت : دیوی بێهەستی زیری مرۆڤ ، وەکـــو گەنجینەیەك وایە ، پڕێتی لەو شارەزاییە توخمیـانەی کە ئەو کەسە لە سەرانسەری ژیانیدا تیایاندا سەرنەکەوتووەو بونەتە هۆی پەشـێویو نالەباری ژیانی دەروونیو ڕەووشتی ئەو کەسە ، سەیر لەوەدایە مرۆڤ خۆیشی نازانێت ، ئەو شارەزاییە سۆزیو توخمییانە کـامانەن ، بـــە ڕێـگەی خەون بینینو ، زوبان هەڵ خلیسکاندنو تواندن نەبێت •

## ٧ ـ ڕێگەی بیر لە خۆ کردنەوە

ئەو زانایانەی کە ئەم ڕێگەیەیان پەسند کردووە ، باوەڕیان وایە کە کەسێتی مرۆڤ ، بەخۆی نەبێتو لە ڕێگەی خۆیەوە نەبێتو بە یارمەتی خۆی نەبێت ، نادۆزرێتەوەو ناناسرێتەوە •

ئەم ڕێگەیە بریتییە لەوەی کەسەکە خۆی بیر لە خۆی دەکاتەوە بیر لەو خۆشیو ناخۆشیانەی ، لە تاقیکردنەوانەی ، لەو بەسەرهاتانەی کە بەسەری هاتوون ، دەکاتەوە ، لە دوایدا دەیان درکێنێتو دەریان دەبڕێت •

فەلسەفەزانی فەرەنسی دیکارت ( ١٥٩٦ ـ ١٦٥٠ ) دەڵێت(*) : من بۆیە هەم چونکە خۆم لە خۆم بیر دەکەمەوە •

باشی ئەم ڕێگەیەش لەوەدایە ، کە هیچ ڕێگەیەکی دیکە نییە ، بری ئەم بکەوێتو بە تەواوی بە قووڵایی بیرودەروونی کەسەکەمان ، بگەیەنێت • هەرچەندێك بە باڵای ئەم ڕێگەیەدا هەڵدەین ، ئەمیش لە تیرو ڕمی ڕەخنەگران بە دوور نەبووە ، لەبەر ئەوەی بە باشی ، دیوی بێ هەستی مرۆڤمان بۆ دەرناخات ، و هەموو کەسێکیش ناتوانێت بە باشی بیر لە خۆی بکاتەوەو ئەنجا مەکەشی بە باشی بگێڕێتەوە ، لە لایەکی

---

(*) رینێه دیکارتی فەرەنگی ساڵی ١٥٩٦ لە دایك‌بووە ، لە قوتابخانەیەکی ئایینیدا فەلسەفەی خوێندوە ، وازی لە خوێندنی فەلسەفە هێنا ، ودەستی کرد بە خوێندن ، و خوێندنەوەی ، کتێبە ئایینییەکان ، تێکەڵاوی یەکی زۆری خەڵکی کرد ، دوایی چوو بۆ هوڵەندا (٢٠) ساڵ گوشەگیری کردو هەربیری دەکردەوە ، باوەڕی وابوو کە جیهان لە ( مادده ، وزیری ) پێکهاتووە ، ماددەی مرۆڤ ، هەموو گیانلەبەرەکان ، هەموو یەکێکەو شێوەیان جیایە ژیری‌یش لە هەموو گیانلەبەرێکدا هەیە ، بە گوێرەی خۆی •

کەوە زۆر دووریش نی یە کـە مرۆڤەکە دوای بیرکردنەوەکە ، پەشیمان بێتەوەو هەندێك زانیاریشمان لە بارەی خۆیەوە لێ بشارێتەوە ٠

## ٨ ـ رێگەی چاوبەیەك کەوتن

رێـگەی چاو بە یەك کەوتن ، یان رێـگەی ( بەرامبەری ) بریتی یە لە وەی کـە ئەگەر ویستت ، جۆری کەسێتی ، کەسێکت بۆ دەرکەوێت، هەوڵ بدە کە چاوت پێی بکەوێت ٠

ئەم رێـگەیە کۆنترین رێـگەو باشترین رێـــگەو بەردەوامترین رێـگەو باوترین رێگەیە ، بۆ دۆزینەوەی کەسێتی لە هەموو بارێـــکی ژیاندا ، چ لە قوتابخانەکا ندا ، یان لە زانکۆکاندا ، چ لە نەخۆشخانەکاندا یان لەباری ژیانی رۆژانەی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە ٠

**باشی ئەم رێـگەیەش لەوەدایە :**

بە چاوپێکەوتن ، جۆنێتی هەڵـکەوتن و رێـکاندنی لەش و ئەندامـە کانی ئەو کەسـەمان بو دەردەکەوێت ، وەکو بالا بەرزی و بالاکورتی یان و پوری و رێـکی نێوان لەش و ئەندامەکانیدا ، هەروەها باری لەش ساغی و جۆری جل و بەرگی ئەو کەسـەشمان بۆ دەردەکەوێت ٠

ئەمـە لـە لایەکەوە ، لە لایەکی دیکەوە ، شێوەی قسەکردن و زمان رەوانی و رادەی توندو تیژی باری سۆزو هەڵچوونیشمان ، بۆ دەردەکەوێت بێجگە لەوەی کە لە کاتی قسەکردندا ، تا رادەیەك زیری و زیرەکی و ئاستی رۆشنبیر یشمان ، بۆ دەردەکەوێت ، بە راستی ئـــەم رێـــگەیە گرنگترین و سەرکەوتووترین رێـگەیە ، کە رابەرەکانی پەروەردەیی ، بۆ دەستنیشان کردنی هۆی دوواکەوتنی قوتابی لە خوێندندا بەکـــاری

بین هـەر لەبەر ئەوەیە کە ئیستیمارەی تایبەتی بۆ نەخشە کیشـراوەو چاپـکراوە •

لەگەڵ ئەو هەموو پیاهەڵنانەیشدا ، ئەمیش لـــە تیرو تانـــەی ڕەخنەگران بەدوور نەبووە ، ئەو ڕەخنانەش ئەمانەن :ـ

١ ـ زۆر جار ڕیدەکەویت ، لێکۆڵەرەوەکە لەبەر ماوە کورتی هەموو ڕوویەکی کەسێتی‌یەکەی بۆ دەرناکەوێت •

٢ ـ زۆر جاریش لێکولەرەوەکە خۆی ، ئەو شارەزایی‌یەی نی‌یە کە بتوانێت ، هەموو ڕوویەکی کەسێتی‌یەکە ئاشکرا کات •

٣ ـ جاری واش ڕێدەکەوێت کە لێکولەرەوەکە ، بە هۆی چـەند بەسەر هاتێکەوە ، ناتوانێت بێ‌لایەن بوەستێت ، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کـە بە لای نیشانەیەك ، یان بە لای چـەند نیشانەیەکی تایبەتیدا دابڕێت‌و دەری خات ، بەڵام چەند نیشانەیەکی دیکە پشت گوێ بخات ، بە هۆی ئەوەوە ، کە دەرکیان ناکات ، و لەبەر ئەوەی دیار نین‌و کوێربوونەتەوە دووبـــــارە •

ئەمجا لەبەر ئەمە لەباتی تاکە کەسێك ، زۆر جار لیژنەیەك ئـــەم مەبەستە بەجێ دەهێنێت •

# کەسێتی پێوەکان

کەسێتی پێو جیاوازی هەیە لەو ڕێگایانەی کە ئێستە باسمان کردن، چونکە ئەم بریتی‌یە لە چەند ئەزموونێکی تاقی کراوەی گومان لێ نەکراو ، و ئەنجامەکەی سوگەرترەو بەمیش بە شێوەیەکی ڕاستەو خۆ کەسێتی مرۆڤی پێدەپێوین •

لەبەر ئەوەی کەسێتی پێوەکان زۆرن‌و ناتوانین باسی هەموویان بکەین ، لەپێشا باسی پێوانەکەی ئیزنك ، دەکەین ، دووای ئەوە دێینە سەر باسی ڕێگە بەسەرا بڕینەکان •

## ١ ـ پێوانەکەی ئیزنك

ئەم پێوانەیە لە چوار کۆمەڵە نیشانە پێکهاتووە ، هەر کۆمەڵەیەك ، لەم کۆمەڵانە هەشت نیشانەی کەسێتی گرتوتەوە •

**بۆ نموونە :**

**کۆمەڵەی یەکەم :**

گورجی ، پشێوی ، تووڕەیی ، زوکار تێکردن ، میزاژ دەمدەمی ، خۆنێ هەڵقورتاندن ( وورژمبردن ، گەش‌بینی ، دڵ ڕەقی ، دەبوێت )•

**کۆمەڵەی دووەم :**

ئەم نیشانانە دەپێوێت : حەز بە تێکەڵاوی ، حەز بە سەرکەوتن ،

زوبان ڕەوانی ، تەبایی ، لێبوردن ، ڕتەوی ، بێ خەمی ، توانا لـــە سـەر پێشەوایی •

**کۆمەڵەی سێیەم :**

ئـــەم نیشانانەی گرتۆتەوە میزاژ ، دڵـەڕاوکێ ، ڕاڕایی لەنگەرداری ، ڕەشبینی ، خۆباراستن ، گۆشەگری ، هێواشی •

**کۆمەڵەی چوارەم :**

ئەم نیشانانەی گرتۆتەوە : دژایەتی ، ووریایی‌و زیری ، ئاسـایش خوازی ، لەنـگەرداری ، پشت بە خۆ بەستن ، باوەڕ بە خۆ بوون ، میزاژ ئاسایی ، لەسەر خۆیی •

ئیزنك هـەر چوار کۆمەڵـــە کەسێتی پێوەکـەی لە سەر هێڵێکی چەقدار (تەوەری) داناوە ، لە سـەرێکیانەوە ئەو نیشانانەی داناوە ، کــە ئەگـەر لە مرۆڤدا هەبن ، بەڵـگەیە لە سەر ئەوەی کەسێکی کراوەی کۆمەڵایەتی‌یە ، ئەو نیشانانەش ، بریتین لە تێکەڵەی نیشانەکانی هـــەر دوو کۆمەڵەی یەکەم‌و دووەم ، بەڵام لە سەرەکەی دیکەیانەوە ، ئـــەو نیشانانەی داناوە ، کـە بوونیان لـە مرۆڤدا ، بەڵـگەیە لە سـەر ئەوەی کە مرۆڤێکی لاگری درزە ، حەز بە تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی ناکـــات ، ئەو نیشانانەش بریتین ، لـــە نیشانەکانی هـــەردوو کۆمەڵەی سێیەم‌و چوارەم •

**ئیزنك دەڵێت :**

کۆبوونەوەی کۆمەڵە نیشانەی دووەم‌و چوارەم لـــە کەسێکدا دەبێتە هۆی دروست بوونی کەسێتی‌یەکی پڕ ئارام ، یان ئارام گــر

بەلاّم کۆبوونەوەی نیشانەکانی کۆمەلەی یەکـەم و سێیەم دەبێتە هـۆی دروست بوونی کەسێتی‌یەکی بێ‌ئارام .

**چەند ڕاستی‌یەك بە لایەن ئەم کەسێتی پێوەوە :**

١ ـ ئیزنك بە جۆرێك نیشانەکانی داناوە ، هەموو کەسێك دەتوانێت ئەو نیشانەیەی ، یان ئەو نیشانانەی ، کـە لە خۆیدا هەن ، هـــەڵیان بژێرێت .

٢ ـ نیشانەکانی هـــەر کۆمەڵێك لە ناو یەکدا دەگونجێن ، واتا ئەگەر یەکێکیان بەهێزبێت ، ئەوە ئەوانی دیکەیش بەهێز دەبن .

٣ ـ هیچ نیشانەیەك لە کۆمەڵێك ناگونجێت لەگـەڵ نیشانەکـانی کۆمەڵەکەی ، تەنیشتیوە ، یان دراوسێیەوە .

٤ ـ تێبینی دەکەین ئەگەر نیشانەیەك لە کۆمەڵێکدا ، بە باشی دیار بێت ، لە کۆمەڵەکەی بەرامبەریشیدا ، بە باشی دیارە .

**بۆ نموونە :**

نیشانەی وورژم بردن ( پێـوە چوون ) ، لـە کۆمەڵەی یەکەمـدا ئەگەر بەهێزبێت ، دەبینین نیشانەی پشت بە خۆ بەستن ، لـە کۆمەڵـەی چوارەمدا زۆر لاوازە .

## ٢ ـ ڕێگە بە سەرا بڕینەکان

ڕێگە بەسـەرا بڕینەکان ، یان ڕێگە ناڕاستەو خۆکان ، بریتین لـــە چەند ڕێـگەیەك کـە بە شێوەیەکی ناڕاستەو خـــۆ ، کەسێتی مرۆڤ دەردەخەن و ئاشکرای دەکەن .

ئەم بشکنینانە ( تصور )و ڕای مرۆف ، لــە بارەی خۆیــەوە دەردەخەن ئەو سۆزو بەربەرەکانێیە دەروونیانەی کە لە دیوی بێ‌هەستی مرۆڤدا هەن‌و متن ، ئاشکرایان دەکەن •

ئەو کەرەستانەی کــە بۆ ئەم مەبەستە بەکـار دەهێنرێت ، ئاسـان‌و ئاسایی‌ترین کەرەستەن ، تەنها پێویستیان بەهێزو هێنانە پێش چـــاو هەیەو بەس ئەمانەش وەکو :ــ وێنەکێشان ، چیرۆك گێڕانەوە ، ڕسـتە دروست‌کردن ، وێنە دۆزینەوە لەپەڵەیەکی مەرەکەبدا •

دەروون زانەکان دەڵێن ئەم ڕێـگا ، ( ناڕاستەو خۆیانە ) بـــە کەڵـکترو باشترن ، لەو ڕێـگا ( ڕاستەو خۆیانە)ی کـە باسمان کردن ، چونـکە لە ڕێـگە ڕاستەو خۆکاندا ، لەوانەیە مرۆڤ بۆی دەس بدات‌و بۆی بلوێت ، چەند ڕاستی‌یەك لە بارەی کەسێتی‌یەکەیەوە ، بشارێتـەوە بەڵام لەمانەدا بۆی نالوێت‌و ڕێـگەی نی‌یە •

چەند نموونەیەکی ئەم ڕێـگایانە ؟

**یەکـــەم :**

پشکنینی (روشاخ)(٣٩) بە هۆی (پەڵە مەرەکەبەوە) :

ئەم جۆرە پشکنینە زۆر باوو بڵاوو کۆنە ، ئەمیش بریتی‌یە لـــە هەشت (تەختە) ، یان لە هەشت (وێنە) ، کە هەندێکیان ڕەنگاورەنگن نیوەشیان پێچەوا نەی نیوەکەی دیکەیانە کە ئەم وێنانە درایە ئەو کەسەی کە مەبەستە کەسێتی‌یەکەی دەربخرێت ، داوای لێدەکرێت کـــە یەکـە

---

(٣٩) هیرمان روشاخ دەروون زانیکی سویسری‌یە ، سالی ١٨٨٤ لـە دایك بووە ، سالی ١٩٢٢ مردووە لە سالی ١٩٢١دا ئەم پشکنینەی بڵاو کردوتەوە •

یەکە لێیان وورد بێتەوەو بزانێت چیان تێدا بەدی دەکات ، یان چیان تێدا دەبینێت ، لەو کاتەدا پشکینەرەکە یەکە یەکە وەڵامەکانی تۆمار دەکات ، تا کۆتایی بە پرسیارەکان دێنێت ، لە دوایدا ئەو زانایە وەڵامەکانی شیتەڵ دەکات‌و جۆری کەسێتی یەکەی دەدۆزێتەوە .

دووەم :

پشکنینی ( هولتزمان ) بە هۆی پەڵە مەرەکەبەوە ) : ئەم پشکنینە بریتی‌یە لە (٤٥) چل‌و پێنج (تەختە ـ لوحە )ی پەڵە مەرەکەب ، ئەم هەر پشکنینەکەی (روشاخ)ە بەڵام بە شێوەیەکی ووردو باش پەرەی پێدراوە .

## ئەوکار کەرانەی کە سێتی مرۆڤ دروست دەکەن

، خوێنەری بەڕێز تا ئێستە زۆر لـە سەرکەسێتی‌و جۆرەکـانی‌و باشترین کەسێتی‌و جۆێتی دۆزینەوەی کـەسێتی دووایین ، لەگـەڵ ئەوەشدا ، تا ئێستە نەمان زانیوە کـەسێتی خـۆی بەخـۆی چۆن چـۆن دروست دەبێت و بـە هۆی چی‌یەوەو چ کـارکەرێك کەسێتی مرۆڤ دروست دەکـات •

لە ڕاستیدا ئەو کارکەرانەی کە بەشداری دروست بوونی کـەسێتی ، مرۆڤ دەکەن زۆر زۆرن‌و هـەر یەکە لە ئاستی خۆیەوە ، بۆشایی‌یەکی کەسێتی پڕ دەکاتەوە ، ئەو کارکەرانەش دەبنە دووبەشی سەرەکی‌یەوە هەندێکیان ناوخۆیین‌و لە ناو لەشدان ، هەندێکیشیان لە دەرەوەی لەشدا کاری خۆیان دەکەنە سەر کەسێتی‌و دروستی دەکەن •

**ئەو کارکەرانەش بە کورتی‌و بە گشتی ئەمانەن :**

**یەکـەم :**

بۆماوە : زانایان دەڵێن : بۆماوە ، دەورێـکی زۆر باڵای هـەیە ، لە گەشەکردنی کەسێتیدا ، چونـکە دەبێتە هۆی جۆێتی دروست بوونی لەش‌و ئەندامەکانی دیوی دەرەوەو دیوی ناوەوەیدا ئەمانیش بە بێ‌گومان کارێـکی گرنگ ، دەکەنە سـەر دروست‌بوون‌و دەرکەوتنی نیشانەکانی کـەسێتی •

بۆ سەلماندنی(٤٠) ئەم ڕاستی‌یە ، هاتوون چەند لێکۆڵینەوەکیان کردووە ، یەکێکیان لە سەر (٦٩٠) کەس ، لەو کەسانەی کە خزمی یەك بوون‌و تووشی شێتی (شیزۆفرینیا)ش بوون ، کردووە ، ئەنجامەکەشی بەم شێوەیە بووە :

— لە نێوان خوشك‌و برای دایکی ، یان باوکی لە ٨/١٪ یان ئەم نەخۆشی‌یە یان هەبووە •

— لە نێوان خوشك‌و برای دایك‌و باوکی ٣/١٤٪ یان ئەم نەخۆشی‌یە یان هەبووە •

— لەنێوان خوشك‌و برایەکداوانەکاندا ٨/٨٥٪یان ئەم نەخۆشی‌یە یان هەبووە •

— لە نێوان خوشك‌و برا جیادوانەکاندا ٧/١٤٪ یان هەیان بووە •

— لە نێوان دایك‌و باوکدا ٢/٩٪ یان هەیان بووە •

— لە نێوان ئەو کەسانەی کە لە ژن‌و ژن خوازی‌یەوە خزم بوون لە ١/٢٪ یان هەیان بووە •

کە کاتێك لەم ئەنجامە وورد دەبینەوە ، تێبینی دەکەین ، کە تا وەکو ، پەیوەندی خزمایەتی نیزیك بێت‌و بە هێزبێت ، ئەوەندە بۆ ماوە ، کارو تینی زیاترە ، و بەپێچەوانەوە ، مانای وایە ( بۆ ماوە ) چۆن بۆ نەخۆشی خستەوە تینی هەیە ، ئاوەهاش بۆ دروست بوونی کەمێتی تینی هەیە •

---

(٤٠) علم النفس وتطبيقاته التربوية والاجتماعية ـ تاليف الدكتور عبد علي الجسماني ص٢٥٠ •

**دووەم :**

ژینگە کۆمەڵێکی دیکە لە زاناکان ڕایان وایە ژینگە تێنکی زۆر تر دەکاتە سەر دروست بوونی کەسێتی هەرچەند ( لاگرەکان ) واتا لایەنگرەکانی تینی بۆ ماوە چاو لە ئاستی تینی ژینگە دەقوچێنن و خۆیان گێل دەکەن ، بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەمەش ، لێکۆڵینەوەیەکە کە نە سەر کۆمەڵێك لە منداڵانی (یەکدوانە) کراوەو دەری خستووە کە ئەگەر بێت و کوڕو کچی (یەکدوانە)ی باوك و دایکێك کە تووشی شێتی ( شیزوفرینیا ) بوبێتن ، ئەگەر پێکەوە لەگەڵیان بژین نیزیکیان بن ، تا گەورە دەبن ، ئەوە لە ٩١/٥٪ یان تووشی نەخۆشی ( شیزۆفرینیا ) دەبن ، بەڵام ئەگەر لەدایك بوون و جیا کرانەوەو لە دایکیان برین ڕێژەی شێت بوونەکەیان دادەبەزێتە سەر ٧٧/٦٪ ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ژینگەی باش و خواردن و خواردنەوەی چاك و ژیانی خۆش و تەندروستی تەواو کارێکی زۆر باش دەکەنە سەر پەروەسەندن و هەڵکەوتنی کەسێتی ، هەر وەکو چۆن بەدخۆراکی کاری خراپ دەکاتە سەر دروست بوونی کەسێتی مرۆڤ .

**بۆ نموونە :**

کەمی خوێ لە لەشدا ، یان خواردنی بێخوێ ، مرۆڤ تووشی خەمباری و خەموکی دەکات ، کەمی ئۆکسجین لە لەشدا ، ئەگەر بێت و مرۆڤیش نەخنکێنێت ، لای کەمی زیانی پێدەگەیەنێت و ڕەووشتی تێك دەدات ، مەی نۆشین و سەرخۆشی بوون و بەردەوام بوون لە سەریان ڕەووشتی مرۆڤ تێکدەدەن و زیان لە لەشیش دەدەن ، خواردنی هەندە دەرمانێك ، وەکو : دەرمانە هێمن کەرەوەکان و ، دەرمانەگورج

کەرەوەکان ، زیانی زۆر لە لەش دەدەن ، بەڵام تا ئێستە ڕادەی ئـــەو زیانە نەزانراوە •

**سێیەم :**

کار تێکردنی رژێنەکان

یەکێکی دیکە لەو کارکەرانەی(٤١) کار دەکەنە سەر دروست بوونی کەسێتی مرۆڤ ، ڕژێنەکانی ناو لەشن ، چونکە ئەگەر رژێنەکان بـــە شێوەیەکی ڕێك و پێك و بە پێی پێویست شلە نەڕێژنە ناو لەشـــەوە ، دەبێتە هۆی ئەوەی لەشی مرۆڤ ، لەنگەری تێك چێت و خۆی ڕانەگرێت و گەشەیەکی پوخت و ئاسایی نەکات ، و بە پێچەوانەوە ، ئەگـــەر ئـــەم ( گلاندانە ) بێ زیادو کەم بە پێی پێویست هۆرمۆن بڕژێننە ناو لەشەوە، ئەوە ئەو کاتە دەبێتە هۆی گەشە کردنێکی ئاسایی ، ئەو کەسە ، چالاکی و سەرکەوتن و بەرهەمی زۆر دەبن •

بۆ نموونـــە : ( ژێر مێشکە گلاند ) ، یان لوی ژێر مێشـــك قەبارەکەی لە دەنکە نۆکێك زیاتر نی یە •

ئەم گلاندە لـــە دوو (قاش) ، یان بابڵێین : لە دوو پل پێك هاتووە ، پلی سەرەوەو پلی خوارەوە •

قاشی سەرەوە هۆرمۆنێك دەرژێنێتە ناو لەشەوە ، دەبێتە هـــۆی گـــەورە بوونی ئێسکە پەیکەر ، و ئەگەر هات و زیاد لە پێویستی ڕژاندە ناو لەشەوە ( لەشی منداڵ ) ، گەشەکردنەکەی زیاد دەکات ، بالای زۆر قوچ دەکات وەکو ئەو کەسانەی بالایان لە دوومەترو نیو (٢½) زیاترە ،

---

(٤١) مجلة العربي العدد ٢٠١ ١٩٧٥ ص٣٦ـ٤٢

کێشێشیان لەسێ سەد (٣٠٠) کیلۆ گرام قورس ترە ، ئەمانە بۆ سەیر جارجار وێنەیان لە سەر ڕووی شاشەی تەلەفزیون ، یان لە سەر لاپەڕەی هێندە ڕۆژنامەو گۆڤارێك دەردەخەن ، بەڵکو لە هەر وولاتێك بۆ نموونە لە شاری بەرلین کە پایەختی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەو ئەوبەری سەر بە ڕۆژ ئاوایە ، یانەی تایبەتی باڵا بەرزەکان هەیە کە تا ئێستە زیاتر لە (١٧) کۆنگرەیان گرتووەو باسی ئەو کۆسپانەیان کردووە کە دێتە ڕێگە یانو دووچاری بوون ، وچۆن ڕامالیان دەکەن .

وە ئەگەر هاتو ئەو کەسەی کە ئەم گلاندە ، هۆرمۆنی زۆر ، دەڕژاندە نێولەشێوە ، منداڵ نەبوو ، بەڵکو گەورە بوو ، ئەوە دەبێتە هۆی زلبوونی و گەورە بوونی ئێسکی دەمو چاو ، وەکو کاجێڕەو شەویلەو لووت ، هەروەها دەبێتە هۆی گەورە بوونی دەستو قاچ .

ئەگەر هاتو ئەم ڕژێنە کەمتر لە پێویستی ڕژاندە نێو لەشەوە ( لەشی منداڵەوە ) ئەوە گەشەی دوا دەخاتو گەنەڵەی دەکاتو لە دوا ڕۆژدا دەبێتە مرۆڤێکی ( بستەبالا )ی ئەندام ڕێك ، بە پێچەوانەی (زەبەلاح)ەوە ئەم باری زیریو زیرەکی هەر لە سەر خۆی دەبێت ، دیارە هەر ئەم گەشە کردنە نا ئاسایی‌یانەیە کە پێشینانی کوردمانیان خستونە هەڵەوە ، کاتێك کە ووتوویانە : مرۆڤی قووچ زیری لە ئەژنوپایەتی ، کورتیش دوو زمانو فێڵبازە ، ئەگینا دەروون زانەکان دەڵێن : بستەبالاییو قووچی زۆر ، ئەگەر بە شێوەیەکی ئاسایی بن ، تین ناکەنە سەر باری ژیری .

ئەگەر بێینەوە سەر بەشی سەرەوەی ئەم ( ڕژێنە ) ، بۆمان دەردەکەوێت ، کە جۆرە هۆرمۆنێکی دیکە دەردەدات ، ئەندامی

زاوزێ گەشەی بێ دەکات، جۆرێکی دیکە دەردەدات، شیری مەمکی ئافرەتی بێ زۆر دەبێت، بەڵام قاشی ژێرەوەیان دوو جــۆرە هۆرمۆن دەردەدات، جۆرێکیان پاڵەپەستوی خوێن ڕێك دەخات، ئەوی دیکەیان ماسوولکە لووسەکان گورج و گۆڵ دەکاتەوە .

وا بزانم هەموو لە سەر ئەوە ڕێکدەکەوین کــە ئێسکەپەیکەری ئاسایی کار دەکاتە ســەر دروست بوونی کەسێتی‌یەکی باش و ئاسایی هــەر وەکو چۆن ئێسکە پەیکەری نائاسایی و ناڕێك ، و ئێسکە پەیکەری بچووکیش دەبنــە هۆی دروست بوونی کەسێتی‌یەکی ناوێزەو نالەبار ، هــەروەها پالەپەستوی خوێن و چالاکی لەش ئەگــەر بە شێوەیەکی تەندروستی و ڕێك و پێك بڕوات ، پەیوەندی مرۆڤ بە ژیــکەوە بــە کەسانی دیکەوە ، پتــەو دەکـــات و دەبێتە هۆی دروست بوونی کەسێتی‌یەکی باش .

بەڵام ئەگــەر مرۆڤ لە گیــان خۆی بێزار بێت ، ئیتر بە هــۆی هەر نەخۆشی و بە شێوەی‌یەکەوە بێت ، کەسانی دیکە وا دەزانن لــەوان بێزارە ، لەبەر ئەوە ، خۆشیان بە چارەیدا نایەت و بە مرۆڤێکی نائاسایی و ئێسك قورسی دەزانن .

نموونەیەکی دیکە ڕژێنی ( سایرۆید ) کــە باوەشی کردووە بەگەردەنی مرۆڤدا ، جۆرە هۆرمۆنێك دە ڕژێنێتە ناو لەشەوە ، پەیوەندی بە گەشە کردن و بە ئۆکسیدینی چەند کەرەستەیەکی کیمیایی ، و لەگەڵ ئۆکسجینداو لەگەڵ هەناسەداندا ، هەیە .

ئەگەر ئەم (ڕژێنە) زیاد لە پێویست بڕژێتە ناو لەشەوە ، مــرۆڤ تووشی جۆرە نەخوشی‌یەکی دڵ دەکات ، وەکو ئەوەی کــە دڵ ســت

دەکات ، یان گەورەی دەکات ، ئەمەش دەبێتە هۆی دوواکەوتنی گەشەی لەش‌و باری ژیریش •

ئەگەر کەم بڕژێتە ناو لەشەوە ، نەخۆشی دەخات ، و شانەکانی لەشێ تووشی ئۆکسیدین دەکات •

بە هیچ جۆرێك ناتوانین چاو لە گرنگی ئەو ئەدرینالینە ، و کۆرتینەو ئەنسۆلینەو هۆرمۆنە توخمیانە ، کوێر کەین ، کە بە هۆی چەند ڕژێنێکەوە دەکەونە ناو خوێنەوەو لەش‌و دەروونی مرۆڤ لە هێندە کات‌و هەلوێستێکی تایبەتیدا ، گورج دەکەنەوە •

**چوارەم : زیرەکی**

چەند لێکولینەوەیەك لەم بارەیەوە کراوون ، دەریان خستووە مرۆڤ تا زیرەکتر بێت ، ئەوەندە بە تواناترە لە سەر گونجاندن‌و پەیوەندی پەیدا کردنی کۆمەلایەتی ، و مرۆڤی زەین کوێر کەمێك پەیوەندی کۆمەلایەتی کەمترە لە مرۆڤی زیرەك ، لەگەل ئەوەشدا هەر ئەو لێکۆلینەوانە دەریان خستووە کە مرۆڤە بلیمەتەکان ، تووشی گیرو گرفتی زۆر دەبن ، لەبارەی پەیوەندی پەیدا کردنی ، باری کۆمەلایەتی‌یەوە ، لە سەر ئە مباسە زۆر ڕۆیشتین لە باسی کەسێتی بلیمەتداو باسی ڕادەی زیرەکی لە دەرخستنی کەسێتی مرۆڤدا •

**پێنجەم : لەش‌و لارو شارەزایی :**

لێکولینەوەی زۆر کراوە ، بۆ دۆزینەوەی ڕادەی بوونی پەیوەندی لە نێوان تەلافەت‌و لە نێوان جۆنێتی دروست بوونی کەسێتیدا ، کە زۆر ترین لە مرۆڤە گەورە ماسوولکە بەهێزەکان ، ئارەزووی سەرکردایەتی‌و

پێشەوایی‌و دەست بە سەراگرتن دەکەن ، هەر ئەو لێکولینەوانە دەریان خستووە ، کە بنچینەو رەچەڵەکی ئەم جۆرە ئارەزووانە ، دەگەڕێتەوەبۆ کاتی منداڵی ، بۆ ئەو کاتانەی کە منداڵانی هاوڕێیان ترساون‌و شەرمیان لێ کردوون ، نەیان توانیوە لە بەردەمیاندا بلێن (لەل) ، بۆیە ئەمانیش گیانی سەروکایەتیان تێدا دروستبووە •

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە قەلآفەت ، واتا جۆری لەش‌و لار ، و ڕادەی شارەزایی منداڵ‌و ڕاهاتنی لە سەر بەربەرەکانی‌و ملەملانی کارێکی گرنگیان هەیە ، بۆ دروست بوونی جۆری کەسێتی مرۆڤ •

**شەشەم :** جۆری پەروەردەو ڕاهێنان :

ڕاهێنانی منداڵ لە سەر پاك‌و تەمیزی ، لە سەر خۆگرتن‌و دان بە خۆگرتندا لەسەر پشت بە خۆبەستن‌و ، هەست بەلێپرسینەوە کردن ، بێ‌گومان کارێکی تەواویان هەیە ، بۆ پاشە ڕۆژی کەسێتی منداڵەکە ، کە کاتێك گەورە بوو •

هەروەها ڕاهێنانی منداڵ لە سەر هێندە خوویەکی کۆمەلایەتی باش وەکوو پێشوازی کردنی میوان ، چاو پۆشین ، لێبوردن ، ڕێزی گەورە گرتن‌و بچوك لاواندن ، حەز بە فێر بوون‌و سەرکەوتن ، چەسپاندنی چەند ئارەزوویەکی هونەری ڕەسەن‌و چەند زانستی‌یەکی بە نرخی پەسەندو بەزەیی هاتنەوە بە گیان لەبەردا ، ئەمانە هەموویان کارێکی بەتین دەکەنە سەر دروست بوونی کەسێتی ئەو منداڵە •

بەڵگەش لە سەر ئەم کارتێکردنانە ، ئەو لێکۆڵینەوانەیە کە مرۆزانەکان ، لە سەر هۆزە سەرەتایی‌یەکانی ئەفریکا ، کردویانە •

خاتو مارگریتلێکا(٤٢) مید لە کتیبەکەیدا ، کە بە ناوی (تازەگینیا)یە ، باسی لێکولینەوەی هەردوو هۆزی ســـەرەتایی ئەفریکی ( ئاوابش )و ( لیندو گومەر )ی کردووە دەڵێت : بۆمان دەرکەوت کـــە زۆر ترینی پیاوو ژنی هۆزی یەکەم ، لە سەر کەسێتییەکی نەرم‌و بەبەزەیی ، و هێمن ، ڕاهـاتبوون •

بەڵام پیاوو ژنەکانی هۆزی دووەمیان ، لە سەر کەسێتییەکی زبرو تووڕەو شەڕانی ، ڕاهاتبوون •

وەدەڵێت هۆی ئـەم جیـــاوازییەش دەگەڕێتەوە ، بۆ شێوەی پەروەردە کردن‌و ڕاهێنانی منداڵانی هەر هۆزێك لەوانە •

**حـــەوتەم : شـــوێن‌و پایە :**

گومان نییە لەوەدا کە پایەی کۆمەڵایەتی‌و پایەی پیشەیی مرۆڤ ، هەردوو کیان ، کار دەکەنە سەر دروستبوون‌و گۆڕانی کەسێتییەکەی • لەبەر ئەوە کۆمەڵێك لە دەروون زانەکانی ئەمریکا دەستیان کردووە ، بە لێکولینەوە،بۆ دیاری کردنی ، ڕادەی کارتێکردنی ، ئەو پایە تازەیەی مرۆڤ دەیگاتی ، یان وەری دەگرێت ، لە ژیانی پیشەیی‌و کۆمەڵایەتیدا • چونکە ، ئەو کەسانەی کـە دەگەنە پایەیەکی نوێ ، دەیان بینین ، هیواو ئامانجێـــکی تازەتریان ، بۆ دروست دەبێت‌و ڕووەو چەند مەبەستێـکی تازەتر دەڕۆن •

زانا لایەنگرەکانی ( تیۆریی ماوە ) زۆر بە گەرمی لایەنی ئـــەم ڕایە ، دەگرن‌و پالپشتی ئـەم جۆرە لێکولینەوانە ، دەکەن ، چونـــکە

---

(٤٢) المدخل الى علم النفس الحديث ص٢٩٨

باوەڕیان وایـــە کردەوەو هەڵس‌و کەوتی مرۆڤ ، بە گوێرەی ئـــەو پێویستی‌یانەیە کـە ژینگەی مرۆڤەکەو ماوەی ژیانی ، دەی ســەپێنن بە سەریدا ، بەڵـکو گۆڕان‌و پەرەسەندنی کەسێتی مرۆڤەکە ، بـە پێی ئەو شوێن‌و کاتەیە کە ئەو تیایاندا دەژی •

## هـــەشتەم : خێـــزان :

لە کوردەواریدا دەڵێن : ( گیا لە سەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە ) بە ڕاستی خێزان یەکێکە لەو کارکەرە گرنگانەی ، کـــە کەسێتی مرۆڤ دروست دەکەن و پەرەی پێ دەدەن •

یەکەم کەس کـە پەردەی لە سەر ڕووی ئەم نهێنی‌یە ، هەڵمـالی (فرۆید) بوو ، دووای ئەو (ئەدلەر)ی هاورێی بوو ، بێجگە لـــەوانیش (یونگیش) دانی بەم ڕاستی‌یە دا ناوە •

بە کورتی دەڵێن : لەگەڵ ئەوەی ناکۆکی‌یەکی زۆر ، لـــە نێوان ئەم سێ زانایەدا ، هەبووە ، هەرسێکیان ، لە سەر ئەم ڕاستی‌یە ڕێکەوتوون بە تایبەتی لە سەر ئەوەی کە لە تەمەنی (هەراش)یدا ئەمە ڕوو دەدات ( فرۆید )ی‌یەکان دەڵێن زۆربەی ئـــەم کارتێکردنە ، لـــە تەمەنی هەراشیدا،ڕوو دەدات،لەبەر ئەوەیە ، کە لەم تەمەنەدایە،مرۆڤ لەگەڵ باوك‌و دایکیدا ، زیاتر تووشی بەربەرەکانی هەستی‌و بێ‌هەستی دەبێت •

( ئەدلەر )ی‌یەکان دەڵێن : تەنهـا لەبەر ئەوە نی‌یە کـە مرۆڤ لـە تەمەنی هەراشیدا ، لەگەڵ دایك‌و باوکیدا ، دەکەوێتە بەربەرەکانی‌یەوە ، بەڵکو لەبەر ئەوەشە ، کـە لە گەڵ خوشك‌و برا کانیشیا ،و کـــەسانی دەوروبەریشدا دەکەوێتە بەربەرەکانی‌یەوە •

بەلام (یۆنگ)ی یەکان ، ئەوەندە گرنگی بە ڕابووردووی مرۆڤ لـە پەرەسەندنی کەسێتی‌یەکەیدا ، نادەن ، بە گوێرەی ئەو گرنگی‌یەی کـە بە حالی حازری (ئێستە)ی ئەو مرۆڤـە دەدەن ، هەرچـەند جۆرەکەلکێك ، بۆ لابردنی گیرو گرفتە دەروونی‌یەکانی مرۆڤ ، لـە زیانی ڕابردووی ، کاتی منداڵ وەردەگرن •

**نۆیەم :** لـەدایك بـڕان :

لە لێکوڵینەوەیەکی نوێدا (٤٣) دەرکەوتووە ، بەری بوونی منداڵ لە سۆزی دایك ، تێنیکی زۆر گەورە ، دەکاتە سەر پەرەسەندنی ،کەسێتی یەکەی ، ئەو لێکوڵینەوە یە دەری خستووە ، کە منداڵ ، تەنها پێویستی بە هەست ، بە گەرمیو ، پاكو خاوێنی ،و خواردەمەنی ، نی‌یە ، بەڵکو زیاد لەوانەش ، پێویستی بە سۆزو ئارامو هاندانو لەباوەش گرتنو دەست بەسەراهێنان ، لاواندنێکی ڕاستەقینە هەیە ، چونکە ئەو منداڵانەی کە لە (لایەلایە)ی دایکیانەوە ، یان لە (لایە لایە)ی ئەو کـەسانەی جێگەی دایکیان گرتوتەوە ، وەکو : نەنكو خوشك،دوورن ، لە (هاتیوخانە)دا ، یان لە کۆشێکی ساردوسڕدا ، دەژین ، هیچ سۆزوبانیو بەزەیی‌یەکی ڕاستەقینەیان نی‌یە ، کەسێتی ئەم منداڵانە ، لە سەر بناغەیەکی بتـەوو قایم دانامەزرێت •

بە ڕاستی ئەگەر منداڵ کەسێکی دلسۆزو ، بانەرو ، لێوردوی

---

(٤٣) محاكم الاحداث والمدارس الاصلاحيــة ـ تاليف سعدى بسيسو ص١٠٧ •

نەبێت ، کە بیدوێنێت و یاری لەگەڵ بکات و بیلاوێنێت ، کە گەورە[44] بوو باوەڕی بە خۆی نابێت و ، ناتوانێت پەیوەندی‌یەکی پڕ سۆزو پتەو لەگەڵ کەسانی دیکە دا ، بۆ خۆی‌دا مەزرێنێت •

★ ★ ★

---

(٤٤) طفلك وصحته الانفعالية ـ تاليف آ٠١٠و٠م ـ ولف ـ ترجمه الى اللغة العربية الدكتور معمر خالد الشابندر ط١ من منشورات مكتبة النهضة في بغداد ١٩٦٢ ص١٧ .

# فەرهەنگۆك

| كوردى | عارەبى |
| --- | --- |
| **پیتی ـ ا ـ** | |
| ئارەزوو | الرغبـــة |
| ئارەزوو بازى | الهـــواية |
| ئارەزوومەندى | الهـــواية |
| ئايروس | غريزة الحب ( الجنس ) |
| ئێسكە پەيكەر | الهيكل العظمى |
| ناوێزە | الشـــاذ |
| ئەفرۆدیت | اله الحب ( خواى جوانى ) |
| **پیتی ـ ب ـ** | |
| بستە بالآ | القـــزم |
| بەربەرەكانى دەروونى | الصراع النفسي |
| بێبەرى | المحـــروم . |
| بـــرى | التعويض |
| بير تێبـەر | الفـــكرة |
| بير تێبەرى گەورەيى | فـكرة العظمة |
| بارا نودە كەسێتى | الشخصية الشكاكة |

| کوردی | عاره‌بی |
| --- | --- |
| بلیمـــه‌ت | العبقـــري |
| بیر هاتنه‌وه‌ی ئازاد | التذكر بطريقة التداعي الحر |
| بۆ مـــاوه | الوراثة |
| بێزراو | مـــكروه |
| **پیتی - پ -** | |
| پێویستی‌یه سه‌ره‌تایی‌یه‌كان | الحاجات الاولية |
| پێویستی‌یه كه‌سێتی‌یه‌كان | الحاجات الشخصية |
| په‌رستگه | معبـــد |
| په‌ری | ملائـكة الرحمة |
| په‌ستی | الكآبة الركـسية |
| پێـــكه‌ر | الدافـــع |
| پل | الفص |
| پایه | المكانة ، المنزلة ، العمود |
| پۆلی نیگه‌تیف | قطب السالب |
| پۆلی پۆزه‌تیف | قطب الموجب |
| پالنه‌ری ژیان ( ره‌مه‌ك ) | غريزة الحياة |
| پالنه‌ری مردن (ره‌مه‌ك) | غريزة الموت |
| **پیتی - ت -** | |
| تۆقین | الفزع ( فوبيا ) |
| ته‌قینـــه‌وه | الارتطام ، الاصطدام |
| تۆبۆلۆژی | علم الانماط |

| کوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| تـــەرز | النمط |
| تەرزی کراوە | النمط المنبسط |
| تەرزی گۆشەگر | النمط المنطوي |
| تەرزی هەلچوو (بۆسەگ) | النمط الاستشاري |
| تەرزی درژ (بۆسەگ) | النمط الكفي |
| تەرزی پڕتەوی چالاك (بۆسەگ) | النمط الحيوي النشيط |
| تەرزی هێواشی نەبزوو (بۆسەگ ) | النمط الهادیء الثابت |
| تێکەلآچوون | التفـــاعل |
| تـــور | المصاب بالتأتاة |
| بیر دۆزی ماوە | نظرية المجال |
| تـــەوەر | محـــور |
| توخـــم | الجنس |

پیتی - ج -

| کوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| جوانـکار | المبـــدع |
| جوانکارە کەسێتی | الشخصية المبدعة |
| جیادوانە | التوائم المختلفة |
| جمە هەلەشە | حركة عشوائية |

پیتی - ح -

| کوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| حەز بە سەرکەوتن | حب الطموح |
| حولحولیە کەسێتی | الشخصية المتقلبة |
| حولحولی | الموسوس |

| کوردی | عارەبی |
|---|---|
| پیتی - خ - | |
| خوای هەڵبەست | ربة الشعر |
| خەو | النوم |
| خەواندنی موگناتیسی | التنويم المغناطيسي |
| خەون | الاحلام |
| خەواندنی سری | التنويم التخديري |
| خۆپەرستی | الانانية |
| خۆنەپەرستی | الغيرية |
| خۆگیر | الضابط لنفسه ( انفعالاته ) |
| خۆنەگیر | غير الضابط لنفسه (انفعالاته) |
| پیتی - د - | |
| دڵەخورپێ | الصدمة |
| دڵەفرکێ | خفقان القلب |
| دڵەڕاوکێ | القلق |
| دڵتەنگی | الكآبة |
| دڵتەنگە کەسێتی | الشخصية الكئيبة |
| دڵە ڕاوکێ کەسێتی | الشخصية القلقة |
| د ژ | المتنافر ، السلبي |
| دژەکان | المتنافرون |
| دژە کەسێتی | الشخصية السلبية |
| دەروون دروست | ذو الصحة النفسية |
| دەستەباڵا | متوسط القامة |

| کوردی | عاره‌بی |
|---|---|
| ده‌مـــار گر | العصبي |
| ده‌مار گره که‌سێتی | الشخصية العصبية |
| دوو که‌سێتی | الشخصية المزدوجة،او ازدواج الشخصية |
| ده‌روون زانی نه‌خوشان | علم النفس المرضى |
| دروشـــم | السمة الشعار |
| دووره‌په‌رێز | المنعـــزل |
| داهێنـــه‌ر | المبتـــكر |
| داهێنه‌ره که‌سێتی | الشخصية المبتكرة |
| دیاره که‌سێتی | الشخصية الظاهرية |
| ده‌رمانه هێمن که‌ره‌وه‌کان | الادوية المهدئة |
| ده‌رمانه شاد که‌ره‌وه‌کان | الادوية المفرحة |
| دەی‌خالآند | اى يضع الخطوط بجانب بعضها |
| دەی‌نه‌خشاند | اى ينقش ويزين الصورة |
| ده‌ره‌چیین | الطبقة الظاهرية |
| ده‌ماخه میزاژ | الميزاج الدماغي |

پیتی ــ و ــ

| کوردی | عاره‌بی |
|---|---|
| رژێن | الغـــدد |
| ره‌نگ کوێری | عمى الالوان |
| ره‌ش‌بین | المتشائم |
| رووناک‌بین | المتفـــائل |
| راده | المستوى ــ |

| كوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| ڕووت | مجـــرد |
| ڕواڵەت | المظـــاهر |
| ڕێگەی ڕاستەکی | الطريقة الايجابية |
| ڕیـــگەی ڕاستەوانە | الطريقة الايجابية |
| ڕیگەی چەپەکی | الطريقة السلبية |
| ڕەووشتی ئاسایی | السلوك الاعتيادی |
| ڕەووشتی ڕێك | السلوك السوي |
| ڕەووشتی زایەندەیی | السلوك الجنسي |
| ڕوانینە ناولەپ | قراءة الكف |
| ڕێگە شیتەڵی‌یەکان | الطرق التحليلية |
| ڕێگەی ووشـە بیرهاتنەوە | طريقة تداعي الكلمات |
| ڕێگە بە سەرا بڕینەکان | الطرق الاسقاطية |

پیتی ــ ز ــ

| کوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| زات | الجرأة |
| زاڵی | الغلبـــة |
| زەین ڕۆشن | المتقدم في الذكاء |
| زەین کوێری | المتاخر في الذكاء |
| زوبان ھەڵخزاند | فلتات اللسان |

پیتی ــ ژ ــ

| کوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| ژمارەیی | الحسابی |
| ژیری لەبار | العقل الراجع |

| کوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| ژینگە | المحيط ، البيئة |
| پیتی - س - | |
| سەرەتایی | البـدائي |
| سرك | الحـذر |
| سکەڕۆ | الاكول |
| سۆزکالی | عديم النضج عاطفيا |
| سەرناس | ذو الفراسة |
| سەرناسین | الفراسة |
| سۆزە کەسێتی | الشخصية العاطفية |
| سۆزە جووتی | ازدواج العاطفة |
| سۆزە ماندوو | الاجهاد العاطفي |
| ساناتۆس (بانگەری مردن) | غريزة الموت ، والهدم والتخريب |
| سەلەف | المجال،الميدان،المسافة المحدودة |
| سەرمۆڕ | المتجـول |
| سایرۆیە ( بڕژین ) | الفئة الدرقية |
| سادیزم | السادية وتقابلها (ماسوشيزم) |
| پیتی - ش - | |
| شکۆ | الهيبة والجلال |
| شیزە کەسێتی | الشخصية الشيزية |
| شیزۆفرینیا | انفصـام الشخصية |
| شێتی شادی و دڵتەنگی | الجنون الدوري |

| کوردی | عارەبی |
|---|---|
| شەونخونی | الاصابة بالارق |
| **پیتی ـ ف ـ** | |
| فریشته | ملائكة الرحمة التي تسكن المنازل وتجلب الحظ والخير للانسان |
| فۆبیا ، ترس | فوبيا ( الفزع ) |
| فرەکەسێتی | الشخصية المتعددة |
| فـــێ | مـــرض الصرع |
| فێروبوونەوەتیو | الاختبار التعليمي او التحصيلي |
| فێڵە بەرگرییەکان | الحيل الدفاعيـــة |
| **پیتی ـ ق ـ** | |
| قـــاش | النص |
| قسە گلماندن | مضغ حروف الكلمات |
| **پیتی ـ ک ـ** | |
| کـەسێتی | الشخصية |
| کەسێتی سروشتی | الشخصية الطبيعية |
| کەسێتی زۆرە سەپێنراو | الشخصية التسلطية الالزامية |
| کەسێتی بیرە سەپێنراو | الشخصية ذو الافعال القسرية |
| کەسێتی خانەگومان | الشخصية الشكاكة في عرضـــه وشـــرفه |
| کەسێتی هیستیری | الشخصية الهستيرية |
| کەسێتی نالەبلر | الشخصية غير المستقرة |

| کوردی | عارەبی |
|---|---|
| کەسێتی ئاستەمبەند | الشخصية المرضة |
| کەسێتی سایکوباسی | الشخصية السايكوباسية |
| کەسێتی دەمار گر | الشخصية العصبية |
| کەسێتی پیشەوا | الشخصية القيادية |
| کەسێتی لەسەرخو | الشخصية الهادئة |
| کەسێتی لوتبەرز | الشخصية المتكبرة |
| کەسێتی رەق | الشخصية المتصلبة |
| کەسێتی هەناوی | الشخصية الاحشائية |
| کەسێتی پڕئارام | الشخصية المستقرة |
| کەسێتی بێ ئارام | الشخصية غير المستقرة |
| کەسێتی ڕاستەوانە | الشخصية الايجابية |
| کەسێتی چەپەوانە | الشخصية السلبية |
| کراوەی بیرەکەری | المنبسط النظری |
| کراوەی سۆزەکەری | المنبسط العاطفي |
| کراوەی هەستەکەری | المنبسط الحساس |
| کراوەی سروشەکەری | المنبسط الالهامي |
| کەسی زراوی | الشخص الصفراوی |
| کەسی ڕەشایی | الشخص السوداوی |
| کەسێتی پێو | اختبار الشخصية |
| کـــەل | الالق |
| کـــال | غير ناضج |
| کینـە کێش | الغيـــور |
| کورتە بالآ | قصير القامة |

| کوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| کەلەگــەت | طويل القامة |
| کەلەمباز | الطفرة |
| پیتی ـ گ ـ | |
| گونجـاندن | التكيف |
| گــرەوە | الشــامل |
| گەجــەر | ذوي الماهة |
| گلاندە ( رژێن ) | الغـــــدد |
| گۆشە گری بیرە گەری | المنطوي النظري |
| گۆشە گری سوزەگەری | المنطوي العاطفي |
| گۆشە گری سروشەگەری | المنطوي الالهامي |
| گۆشە گری سروشەگەری ساکار | المنطوي الالهامي البسيط |
| پیتی ـ ل ـ | |
| لەیەکبران | الفــــــراق |
| لامێژی | التطفــل |
| لەش و لار | البنية والاطراف |
| لیــکەرژێن | الغــدة اللعابية |
| لەکیس چوون | الخيبــــة |
| لەنـــگەر | التـــوازن |
| لەشە کەسێتی | الشخصية الجسمية |
| لاگرەکان | المتطرفون |
| لەبیدۆ ( وزەی زایندەیی ) | المصدر الاعلى للطاقة الجنسية |
| لوی زۆر مێشک | الغـدة النخاعية |

| کوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| **پیتی - م -** | |
| ملەملەی دەروونی | النزاع النفسي |
| مـەی نۆشی | شارب الخمور |
| میزاژ بریتی‌یە لە (تەبیعەت)ی گشتی مروڤ ، بەتایبەتی لەبارەی سۆزو ئارەزو حەزەوە | |
| میزاژی شادو دڵتەنگ | الميزاج الدوري |
| مشەخۆر | المتطفل |
| ماسوشیزم | ويقصد بها الشذوذ الجنسي الماسوشي |
| مانـــگر | العنيد ، المضرب |
| مرۆزان | الانثروبوولوجي |
| **پیتی - ن -** | |
| ناوەخن | حشو ، مضمون |
| نائومێد | ميؤوس |
| نیشانە | سمة ، صفة ، علامة |
| ناونیشان | العلامة ، العنوان |
| نزمەکەسێتی | الشخصية المتدنية |
| ناسکەکەسێتی | الشخصية الرقيقة |
| ناوەچین | الطبقة الداخلية |
| ناوەندەچین | الطبقة المتوسطة |
| ناڕاستەوخۆ | غير مباشـــر |

| کوردی | عارەبی |
|---|---|
| نەخۆشی یە درۆزنە | الـكذب المرضي |
| نەشتەرگەری | العملية الجراحية |

پیتی – و –

| | |
|---|---|
| ویست | الارادة |
| ویژدان | الضمير |
| وەرسی | السـأم |
| ووزەی زایەندەگی | لبيدو (الطاقة الجنسية العليا) |

پیتی – ه –

| | |
|---|---|
| هەناسە ساردی | الخيبــة |
| هەست بە کەمــەری | الشعور بالنقص |
| هەمەلایی | الشـامل |
| هێلی زەنگلەپێچ | خط المنحنى الجرسي |
| هەستێکی بەپێز | حس مرهف |
| هێلی چەقدار ( تەوەرێ ) | الخط المحوري |
| هــەراش | الحـشـ |
| هەتیوان | دار الايتـام |
| هەلچوون لێڵ | كـدر الانفعـال |
| هانەری زایەنەیی | الحافز الجنسي |

پیتی – ی –

| | |
|---|---|
| ( یەکدوانە ) دڤانە | التوائم المتحدة |

| کوردی | عارەبی |
| --- | --- |
| یادکردنەوەی ئازاد | التفکیر بالتداعي الحر |
| یەکتـــا | الوحـــدة |
| یاد کردنەوە | التذکر |
| یاد نەکردنەوە | عدم التذکر |

# گرنگترین ئەو سەرچاوانەی کەلکم لێوەرگرتوون


١ ـ الابراشي ، محمد عطية ـ الشخصية ـ ط٣ ١٩٣٨ ؟

٢ ـ بركات ، محمد خليفة ـ تحليل الشخصية ـ ط١ ـ دار الطباعة للنشر ـ في مصر •

٣ ـ بێکەس ، فائق ـ ديوانی هەڵبەست ـ چاپی یەکەم ١٩٨٠ لە بەغداد

٤ ـ بدوی ، عبدالرحمن ـ افلاطون ـ ط٤ ١٩٦٤ ـ القاهرة ـ مصر •

٥ ـ برهانرت ، علم النفس في الحياة العملية ـ ترجمه الى اللغة العربيـــة الدكتور عبدالله ابراهيم محيى ط١ مطبعة الرابطة ١٩٥٥ ـ بغداد •

٦ ـ نوتكارت ، برنارد ـ سايكولوجيه الشخصيـــة ـ ترجمه الى اللغـة العربية الدكتور صلاح مخيمر ط١ دار الطباعة الحديثة في بيروت •

٧ ـ جلال ، سعد ـ في الصحة العقلية ـ ط١ مطبعة رويال ١٩٥٦ القاهرة

٨ ـ الجسماني ، عبـــد علي ـ علم النفس اســـه وتطبيقاته التربوية والاجتماعية ط٢ مطبعة الخلود ١٩٨٤ ـ بغداد •

٩ ـ الحفنى ، عبدالمنعم ـ موسوعة علم النفـس والتحليل النفسي ط١ مطبعة دار العودة ١٩٧٨ ـ بيروت •

١٠ ـ راجح احمد عزت ـ الامراض النفسية والعقلية ـ مطبعة المعارف القاهـــرة •

١١ ـ راجح احمد عزت ـ اصول علم النفس ـ ط٣ مطبعة جامعة الاسكندرية ١٩٦٨ ـ جمهورية مصر العربية •

١٢ ـ شرارة ، عبداللطيف ـ دائرة المعـــارف السايكولوجيه ( سحر الشخصية ) دار صادر في بيروت ١٩٦٤ لبنان •

١٣ ـ الشماع ، نعيمة ( الشخصية النظرية ، التقيم ، مناهج البحث )ط١ مطبعة العربية الحديثة من منشورات جامعة الدول العربية ١٩٧٧

١٤ـ عبدالسلام ، حامد ـ الصحة النفسية والعلاج النفسي ـ ط٢ الناشر مكتبة عالم الكتب ـ ١٩٧٨ •

١٥ ـ طرابيشي ، جورج ـ محاضرات جديدة فيالتحليل النفسي (ترجمة) ط١ مطبعة دار الطليعة ١٩٨٠ ـ بيروت •

١٦ ـ غالب ، مصطفى ـ فصام الشخصية ـ ط٤ مكتبة الهلال ١٩٨٤ بيروت •

١٧ـ فرويد ، ـ معالم التحليل النفسي ـ ترجم الى اللغة العربية باشراف الدكتور محمد عثمان نجاتي ـ ط٥ ١٩٨٣ ـ القاهرة •

١٨ـ فرويد ـ الاناو الهي ـ ترجمه الى العربية الدكتور محمد عثمان نجاتى ط٤ ١٩٨٢ القاهرة •

١٩ ـ فرويد ـ مقدمة في التحليل النفسي ـ ترجمه الى اللغة العربية الاستاذ اسحق رمزى ط١ مطبعة دار المعارف ـ مصر ـ

٢٠ ـ القوصي ، عبدالعزيز ـ اسس الصحة النفسية ـ ط٣ مطبعة مصر ١٩٤٨ القاهرة ٠

٢١ـ كارنيجي ـ ديل ـ كيف تكسب الاصدقاء ـ ط٥ مطبعة السنة المحمدية ١٩٥٨ مصر ٠

٢٢ـ الهاشمي ، خالد وأحمد حسن الرحيم مبادىء التربية ـ ط٢ ١٩٦٢ بغداد ٠

٢٣ـ عبدالدائم ، عبدالله ، واسعد رزوقي ـ موسوعة علم النفس ـ ط١ مطبعة المؤسسة العربية للطباعة والنشر ١٩٧٧ ـ بيروت ٠

٢٤ ـ لندزي ، ك ، هول ، ج ـ نظريات الشخصية ـ ترجمه الى العربية الدكتور احمد فرج وجماعته ، ط١ الناشر الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر ١٩٧١ ـ القاهرة ٠

٢٥ـ مكبرايد ، دبليو ، جي ـ الشعور بمركب النقص ـ ترجمه الى العربية كاظم سلمان البدرى ط١ ١٩٦٦ بغداد ٠

٢٦ـ نيكتين ، فاسيلي ـ الاكراد ـ ط١ دار الروائع ١٩٦٧ ـ بيروت

٢٧ـ حافظ ، نورى ـ تكوين الشخصية ـ ط١ مطبعة المعارف ١٩٦١ بغداد ٠

٢٨ـ عاقل ، فاخر ـ اعرف نفسك ـ ط١ ١٩٤٢ ـ بيروت ٠

٢٩ـ لويس بش ـ المرض النفسي طريق الى السعادة ـ ترجمه الى اللغة العربية عبدالمنعم الزيادى ط١ ١٩٥٧ ٠

٣٠ـ رفعت ، محمد ـ الامراض النفسية والعصبية ـ ط٢ دار المعارف للطباعة والنشر ١٩٧٧ ـ بيروت ٠

٣١- نايت ، ركس ، ومركريت نايت - المدخل الى علم النفس الحديث ترجمه الى اللغة العربية الدكتور عبد علي الجسماني ط٣ ١٩٨٤ بغـــــداد .

٣٢- سلامة موسى - عقلي وعقلك - ط٢ ١٩٥٣ - القاهرة .

٣٣- سلامة موسى - الشخصية الناجحة - ط٣ - القاهرة .

٣٤- جلال ، صبري - مشكلة السلوك السايكوباسي - ط١ مطبعة دار المعارف القاهرة .

٣٥- القوصي ، عبدالعزيز - علم النفس اسسه وتطبيقاتـــه التربوية ط٤ مطبعة مصر ١٩٥٤ - القاهرة .

٣٦- ياسين ، محمود عطوف - دراسات سايكولوجيه معاصرة - ط١ مطابع مؤسسة نوفل ١٩٨١ بيروت .

٣٧- الخجل اسبابه وعلاجه مـــن منشورات مطبعة الاداب في النجف الاشرف ١٩٧٢ .

٣٨- محوى - ديوان شعر - باللغة الكردية ط٢ ١٩٨٤ بغداد .

٣٩ - كمال ، علي - النفس - ط٢ ١٩٨٣ - بغداد .

٤٠- سلامة موسى - دراسات سايكولوجيه - ط١ مطابع دار الكتاب العربي في مصر .

٤١- ولف ، آنا ، و. م - طفلك والصحة الانفعالية - ترجمه الى اللغة العربية الدكتور محمد علي الشابندر ط١ ١٩٦٢ بغداد .

٤٢- أدموندز ، سي . جي - كورد ، ترك ، عرب ، ترجمه الى اللغـــة

العربية الاستاذ ـ جرجيس فتح‌الله طـ١ مطبعة تايمس ١٩٧١ فـي بغـــداد •

٤٣ـ ميجرسون ـ رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين وكردستان ـ ترجمه الى اللغة العربية الاستاذ فؤاد جميل ـ طـ١ مطابع الجمهورية ١٩٧٠ ـ بغـــداد •

٤٤ـ الجاوشلي ، هادى رشيد ـ الحياة الاجتماعية في كردستان مطبعـــة الجاحظ ١٩٧٠ في بغداد •

٤٥ـ سعدى بسيسو ـ محاكم الاحداث في الطرق والمدارس الاصلاحية ؟

٤٦ـ مجلة العربي ـ العدد ١٧٣ نيسان ١٩٧٣ •

٤٧ـ مجلة العربي ٢٠١ ، ١٩٧٥ •

٤٨ـ مجلة العربي ٣٢٦ ، ١٩٨٦

٤٩ـ مجلة العربي ٨٩ ابريل ١٩٦٦

مجلة العربى ٣٢٠ ، ١٩٨٥

٥٠ـ مجلة العربى ٣٠٣ ، ١٩٨٤

٥١ـ مضار التدخين ـ اعداد لجنة في وزارة التربية طـ١ مطبعـة وزارة التربية المرقم (٢) ١٩٨٠ •

٥٢ـ طه حسين ـ التوجيه الادبي طـ١ القاهرة ١٩٤٠ •

٥٣ـ مجلة ( پەروەردەو زانست ) باللغـــة الكردية (٧ ، ٨ ) السنة الرابعـــة ١٩٨٤ •

٥٤ ـ فەرھەنگی ئەستێرە گەشە فاضل نظام الدین ج (١) الاجیـــال
١٩٧٧ بەغداد

٥٥ـ لیستەی جوارەمی زاراوەکـــانی کۆڕی زانیاری کورد پێشەکی‌و
ڕێکخستنی دکتور عبدالرحمن حاجی مارف ج (١) چاپخانەی کۆڕی
زانیاری کورد ـ ١٩٧٥ بەغدا .

٥٦ـ مجلة ( پەروەردەو زانست ) العدد ١٤ ١٩٧٨ .

٥٧ ـ مجلة (نوسەری کورد) العدد (٦) ١٩٨١ ص١٠٨

# پێرست

لاپەرە


| | |
|---|---|
| پێشـــەکی | ٣ |
| واتەی ووشەی کەسێتی لە زمانی کوردیدا | ٧ |
| پێناســەی کەسێتی مرۆڤ . | ١٠ |
| نیشانەکانی کەسێتی . | ١٥ |
| جــــلو بەرگو کەسێتی | ٢٠ |
| زیرەکیو کـەسێتی | ٢٢ |
| خوش‌زمانی ، و کەسێتی . | ٢٥ |
| دلپاکیو کەسێتی | ٢٧ |
| نیشانەبالاکانی کەسێتی مرۆڤ . | ٢٧ |
| هەستی کۆمەلایەتیو کەسێتی . | ٣٠ |
| خۆ نەبەرستی . | ٣١ |
| خزمەتــگوزاری . | ٣٥ |
| چەند نموونەیەك بۆ مرۆڤی خزمەتگوزار . | ٣٦ |
| نیشانە باشەکانی کەسێتی لە کۆمەلی کوردیدا | ٤٠ |
| پەسندترین نیشانەی کەسێتی لە کۆمەلی کوردیدا | ٤٤ |
| جۆرەکانی کەسێتی مرۆڤ | ٤٩ |
| دابەشکردنەکەی هیبوکرات | ٥٠ |
| دابەشکردنی کەسێتی بە لای کریتشمارەوە . | ٥٢ |
| رەخنەگرتن لە کریتشار . | ٥٦ |
| دابەشکردنی کەسێتی بە لای ( یونگە )وە . | ٥٧ |
| دابەشکردنی کەسێتی بە لای ( سپرانج )وە . | ٦٠ |
| کەسێتی ئاسایی ، کامەیە ؟ | ٦٠ |
| کەسێتی گوشەگر کامەیە ؟ | ٦٢ |
| کەسێتی کراوە کامەیە ؟ | ٦٣ |
| شێزە کـەسێتی . | ٦٥ |
| دلتەنگە کەسێتیو نیشانەکانی . | ٦٥ |
| کەسێتی زۆرە سەپێنراو ونیشانەکانی | ٦٨ |
| بارا نۆدە کەسێتی . | ٧١ |
| کەسێتی سایکوباسی (سەرسەری)و نیشانەکانی | ٧٢ |

لاپەڕە


| | |
|---|---|
| کەسێتی هێستێری و نیشانەکانی | ٧٣ |
| کەسێتی بەئاستەم بەند • | ٧٦ |
| کەسێتی میزاژ فلێکماتی | ٧٦ |
| نزمــه کەسێتی • | ٧٦ |
| ســوزە کــەسێتی • | ٧٧ |
| کــەسێتی بلیمــەت • | ٧٨ |
| نیشانەکانی کەسێتی بلیمەت | ٨٥ |
| چۆن دەبیتە کەسێتی یەکی سەرکەوتوو ؟ | ٩٠ |
| حەفدە (١٧) خاڵ دەتکەنە مرۆڤێکی سەرکەوتوو | ٩٢ |
| گرنگترین ئەو گیروگرفتانەی کەسێتی مرۆڤ دوا دەخەن | ١٠٥ |
| چۆن کەسێتی مرۆڤ دەناسینەوە ؟ | ١١٠ |
| کەسێتی پێوەکان | ١٢٢ |
| پێوانەکەی ئیزنك | ١٢٢ |
| ڕێگە بە سەرا بڕاوەکان | ١٢٤ |
| پشکنینی روشاخ ( پەڵەمەرەکەب ) | ١٢٥ |
| ئەو کارانە کامانەن کە کەسێتی مرۆڤ بەهێز دەکەن ؟ | ١٢٧ |
| بۆماوە ، ڤێکە ، ڕژێنەکان ، زیرەکی | ١٢٨ـ١٣٣ |
| لەش و لار ، پەروەردە • | ١٣٤ |
| فەرهەنــگۆك | ١٣٩ |
| سەرچاوەکان | ١٥٢ |